ناوی کتێب: تەفسیری گوڵشەن

ناوی نوسەر: نظام الدين عبدالحميد

چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیربۆ بڵاو کردنەوە

ناوەڕۆک: جمعه صديق كاكه

خەت: نەوزاد کۆیی

بەرگ: أمين مخلص

نۆرە و ساڵی چاپ: سێیەم ١٤٣٣_ ٢٠١٢

تیراژ: ١٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردن ( ٤٨ )

ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە

# پێشەکی چاپی سێ یەم

## بەناوی خوای بێ هاوتای میهرەبان

برای خوێنەری خۆشەویست، ئەمەی بەدەست تەوەیە چاپی سێ یەمی ئەم تەفسیرەیە، لەچاپی دووەمی تەفسیرەکەدا تکام وابوو لەچاپی یەکەمی باشتر بێت، بەڵام بەداخەوە ئەوەی دەمویست وادەرنەچوو، تەماشام کرد دێڕی لاپەڕەکانی پاڵی بەیەکترەوە داوە و ووشەکانی زیاد گچکە کراوەتەوە، هەروەها بەوشێوەیە دێڕی وشەکانی قورئانی پیرۆزیش.

جگەلەمانە تەماشام کرد لەلاپەڕەی (٢٢٥) لەئایەتی (٩٢) وشەی (مِن) دوبارە کراوەتەوە، هەروەها وشەی(لكم) لەئایەتی (٩٦) لەلاپەڕەی (٦٠٨)، وە لە لاپەڕەی (١١١٣) لەئایەتی (٣) نزیکەی دە ووشە پەڕیوە و لەقورئانەکەدا دەرنەکەوتووە، ئەمە جگە لەچەند هەڵەیەکی دیکە لەناو تەفسیرەکەدا رویدابوو، وەکو گێرانی پیتی (ص) بە(ڵ) وەکو(میصر) کەلەهەندێك جێگادا کراوەبە(میڵر) وەگێڕانی (ط) بە(ك) وەکو (فیطرة) کە کراوەبە(فیکره).

تەفسیرەکە لەگەڵ ئەمەشدا کە سێ هەزارنوسخەی لێ چاپکرابوو لەماوەیەکی کەمدا لەکتێب خانەکاندا هیچی وای نەما و خوێندەواران چاوەڕێی چاپێکی دیکەی دەکەن.

ئینجا پێویست بوو جارێکی دیکە ڕوی پێبکەمە چاپکردن، بەڵام پێش ئەم ڕوتێکردنە چاوێکم بەهەموو تەفسیرەکەدا خشاند و لەگەلێك جێگا دەستکاریم کرد و لەچەند جێیەك زیادەم تێخست، تکام وایە ئەم جارە بەجوانی و بەرێکی بەو شێوەیەی کەنەمەوێت بگاتە دەست خوێندەوارانی بەرێز و دڵڕوناك.

نظام الدين عبد الحميد

# پێشەکی چاپی دووەم

## بەناوی خودای بەرزی بێ وێنەی میهرەبان

ئەم تەفسیرەم پێش ئەوەی یەکەم جار رووی پێبکرێتە چاپکردن لەمرۆڤێکی خزمی زیرەك وتا رادەیەك زاناو بنەماڵە ئایینی پرسیارکرد کەچەند نوسخەی لێ چاپ بکەم و ئایە لەناو کوردەواریدا رەواجی ئەبێت و خوێندەواران رووی تێئەکەن؟ وەڵامی دامەوە و وتی: نووسینی ئایینی لەناوخوێندەوارانی کورد رەواجی نییە، خەڵکی کەم بەلایەوە دەچن، ئەوەی کەتۆ دەتەوێت چاپی بکەیت لە(٥٠٠) نوسخە زیاتر سەرف نابێت.

ئینجا رونەکەمە ئەو خزمەو هەموو برایەکی خۆشەویستی دڵرۆناك و ئەڵێم: ئاینی پیرۆزی ئیسلام رەگی لەقووڵایی دڵی زوربەی خوێندەوارانو نەخوێندەوارانی کورد داکوتیوەو دەروونیانی بە رووناکایی قورئانی پیرۆز رووناك کردۆتەوەو، هەڵکەندنی و جیاکردنەوەی لەتوانای ئەوبەشە کەمە بیرشڵەژاوە خوێندەوارانە نییە کە ئەیانەوێت میللەتی کورد لەئاینەکەیان دوور بخەنەوەو بەلای بێ باوەڕییەوە بیبەنو رەوشتی بێ پەروابیان بەسەر هەموو رەوشتێکی ئایینیا بێنن.

ئایینو بیروباوەڕی ئیسلام لەکۆنەوە رەگی لەقووڵایی دڵو مێشکی میللەتی کورد داکوتیوەو تیانا جێگیر بوە، چونکە میللەتی کورد یەکەمین میللەتە دوای میللەتی عەرەب کەبڕوای بەئایینی ئیسلام هێناوەو بەهەموو دڵێکەوە دوای کەوتووە، چەند کەسێکیان بەخزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتوونو شەرەفی یارێەتی (صەحابایەتی) پێغەمبەریان بەسەرادابڕاوە.

ئنجا بۆیە دەبینین کتێبخانەکان لەبازاڕەکانا پڕن لەنووسینی ئایینی و خوێندەواران بەزۆری بەدوایانەوە دەسوڕێنەوەو عەودالیانن. بۆ نموونە

دەبینین تەفسیری (ئاسان) کەماموٚستا (بورهان)نووسیویەتی تائێستا (پێنج) جار لەچاپ دراوە.

ئەم تەفسیرەی من کەدوو هەزار نوسخەی لیٚ چاپکرا لەماوەیەکی کەمدا هیچی لەکتێبخانەکانا نەما. خوێندەواری خوٚشەویست پێشەکی چاپی دووەم لەچاپی دووەم دا لەوەی کە ئێستا خوێندوتەوە درێژتر بوو، بەلاّم لێرەدا بەپێویستم نەزانی هەموی دوبارە بکەمەوە، بوٚیە بەشێکی زوٚرم لێدابڕی وەبەم شێوەیە ئەیخەمە بەرچاو.

نظام الدين عبدالحميد

٧ربيع الاول /١٤٢٧

٥ /٤/٢٠٠٦

# پێشەکی چاپی یەکەم

حەمدو ستایش و سوپاسی فراوان بۆ خودای بەرزی بێ وێنە، کە هەموو کائیناتی لە نەبوونەوە هێناوەتە دی و پەروەردگاریەتی، ئەو خودایەی کە هەموو گیانلەبەران و بێ گیانان، لەسەر زەوی و، لە قوڵایی دەریاکانداو ئەو ملیارەها گەلە ئەستێرەو ئەستێرانەی کە بە شەوان لەو بۆشایی یە بەربڵاوەی لەسەرمانەوەیە دەدرەوشێنەوە، هەموویان بە زمانی حاڵ شایەتی دەدەن لەسەر بوون و تاك و تەنهایی و گەورەیی و دەسەڵاتە بێ سنوورەکەی، کە ئەم عالەمەی هێناوەتە دی و هەڵیدەسوڕێنێت و کاروبارەکانی بەڕێوە دەبات.

درود و سڵاوی خودا بۆ سەر گیانە پاکەکەی پێغەمبەری پێشەواو سەرجەم شوێنکەوتوانی دێرین و نوێ، کە لە ژیانیاندا پەیڕەوی ڕێبازە راست و بەختەوەری بەخشەکەی بوون، تا کۆتایی بە دنیا دێت و ڕۆژی دوایی دێتە کایەوە.

ئەو پێغەمبەرە گەورەی(ﷺ) کە خودا کردوویەتی بە رەحمەت بۆ هەموو عالەم و رابەرو پێشەوای سەرجەم مرۆڤایەتی، تا ڕۆژی دوایی، ئەو پێغەمبەرەی کە خودا بەرزترین فەرمایشتی خۆی (کە قورئانی پیرۆزە) بۆ ناردوەتە خوارەوە، کە گەورەترین هیدایەت و رەحمەتی خودایە بۆ مرۆڤایەتی و باشترین یاسای ژیانەو شوێنکەوتنی مایەی سەرفرازیی و ئاسوودەیی هەردوو ژیانە، بەو مەرجە مرۆڤ بەجوانیی شوێنی بکەوێت و بەپێی فەرمانەکانی و ڕێنماییەکانی ژیانی خۆی بباتە سەر. چونکە ئەوەی مرۆڤو کۆمەڵگەو دەوڵەت پێویستیەتی، لە قورئانی پیرۆزدا هێڵە گشتیی یەکانی بۆ دیاری کراوە.

جا ئەو پێویستیە ج لە بواری بیروباوەڕو عەقیدەو خوناسیی و پەرستنیەوە بێت، یان لە بواری ڕێکخستنی باری ئابووریەوە بێت، یان لە بواری

سەقامگیرکردنی شوراو دادپەروەریەوە بێت، یاخود لە بواری پەیوەندییە خێزانییەکان؛ پەیوەندی ژن و مێردو بەخێوکردن و پەروەردەی منداڵەوە بێت، یاخود لە بواری کڕین و فرۆشتن و بازرگانی و پیشەسازیدا بێت، یاخود لە بواری رووبەڕووبونەوە لەگەڵ دوژمن و شەڕکردنندا بێت، یاخود لە بواری یاساکانی سزادانی کەسانی تاوانباردا بێت، کە ستەم لە خەڵکی دەکەن و دەستدرێژیی دەکەنە سەر ماڵ و گیان و ناموسیان.

بەم شێوە ڕێنماییەکانی قورئانی پیرۆز هەموو بوارەکانی ژیانی ئادەمیزادی گرتوەتەوە، هیچ شتێک، یان بوارێک نیە کە قورئان ڕێنمایی لە بارەیەوە نەدابێت، یان ئاماژەیەکی پێ نەکردبێت، جا ئیتر، یان بە درێژیی، یان بە کورتی ئاماژەی پێکردووە، تا دواتر پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە فەرموودە شیرینەکانی زیاتر رووناکی بکاتەوەو وردەکاریەکانی باس بکات.

جا هەروەکو وتمان قورئانی پیرۆز مایەی هیدایەتە بۆ گشت ئادەمیزادێک، بە تایبەتی بۆ موسڵمانان، کە گەلی کوردی ئێمەیش بەشێکیانەو، لە پاش عەرەبەکان، پێش هەموو گەلانی تر موسڵمان بوون و، هاوەڵێتی پێغەمبەریان پێ براوە.

ئیبنوحەجەر لە کتێبی (الاصابة في تميز الصحابة)کەیدا دەڵێت: (جابانی کوردی) ناوێک چەند جارێک گەیشتووە بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) وە(مەیمون)ی کوڕی ئەو زاتە وتویەتی: باوکم دە جار بەخزمەت پێغەمبەر گەیشتووە. جا داخۆ هەر جارە چەند کەسی کوردی لەگەڵدا بوو بێت و موسڵمان بووبن؟!

گەلی کورد لەو ڕۆژەوە کە ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان پێگەیشت، بە هەموو دڵێکیانەوە موسڵمان بوون و، ئاشنایەتییان لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا بەستووەو فێری خوێندنەوەی بوون، هەر لە دێر زەمانەوەو تا ئێستایش کەم کەسی کورد هەیە کە سوورەتی فاتیحاو بە لایەنی کەمەوە چەند سوورەتێکی تری لە سوورەتە کورتەکان کە لە نوێژدا دەخوێنرێنەوە لەبەر نەبێت. ئەوەی کە

فێربـوون و زانیویانــە، بـەبێ ئـەوەی پیتـەکانی بـە لـەنگیی بخوێننــەوە، بـە پێچـەوانەی هەنـدێکی تـر لـە گـەلانی موسـڵمان کەنەگـەر وشـەیەکی قورئـان بخوێنێتـەوە، کـە پیتـی (کـاف)، یـان پیتـی (حـێ)ی تیـا بێـت، کافەکـە دەکـات بــە(گـاف)و حێیەکـەش بـە(هـێ) لـەجیاتی بڵـێ: (ئەلحەمـدو...) دەڵێـت: (ئەلهەمدو...).

ئینجا پێویستە لەسەر هەر موسڵمانێکی کوردزمان، جا خوێندەوارییەکەی لە هـەر ئاسـتێکدا بێـت، مانـاو مەبەسـتی ئـەو قورئانــە پـیرۆزە بزانێـت کـە دەیخوێنێتەوە. لەبـەر ئـەوە زۆر پێویستە تەفسیری قورئـانی پـیرۆز بـە زمـانی کـوردی هـەبێت، وە تـا تەفسـیرەکان زۆرتـرو روونـتر بـن چـاکترە، تـا مانـای ئایەتەکان بە روونی بکەوێتە پێش چاوی خوێنەران. بێگومان پێویستە لەسـەر ئـەو کەسـانە کـە دەیانـەوێ تەفسیر بنووسـن، ئاسـتی شـارەزایی و زانینیـان لـە ئاستی ئـەو کـارە گەورەیـەدا بێـت، تـا تەفسـیرەکانیان دوور بێـت لـە قسـەی بـێ جێو پڕوپووچ و (ئیسـرائیلیات) کـە زۆربـەی درۆیـە، وە تەفسـیرەکانیان ببێتـە مایـەی بەرچاوڕۆشـنیی موسـڵمانانی کـورد بـۆ زیـاتر تێگەیشـتن لـەو پەیامـە پیرۆزەی پەروەردگاریان.

من کەچەند ساڵێك لەمەو پێش لە کولیەی زانستە ئیسلامیەکان لە بەغـداد مامۆستا بووم، ئـاواتم ئـەوە بـوو خـودا یارمـەتیم بـدات تـا بتـوانم تەفسـیرێکی کورتی قورئانی پیرۆز بە زمانی کوردی بخەمە بەر دەست براو خوشکانی کـورد زمـانم و، بچمە ڕیـزی ئـەو مامۆسـتا بەڕێزانـەی کـورد، کـە تەفسـیری قورئـانی پیرۆزیان بە کوردی نووسیوە، کە بەداخەوە ژمارەیان زۆر کەمە.

جا دەمویست تەفسیرەکە بەشێوەیەکی کـورت بێـت، کـە هـەر لاپەڕەیـەکی تەفسیرەکە لاپەڕەیەکی لە قورئان لەگەڵدا بێت و، بە دەوریدا مانای ئایەتەکانی ئەو لاپەڕەی قورئانە لە هەمان لاپەڕەی تەفسیرەکەدا جێگەی ببێتەوە.

بەڵام چونکە لەو کاتەدا لەگەڵ دەرس وتنەوەو نووسینەوەی ئەو دەرسانەی کە بە قوتابییەکانم دەوتەوە، خەریك بووم، ئەمپەرژایە سەر بە دیهێنانی ئەو ئاواتەم.

لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٩٣)دا خۆم خانەنشین (تقاعد) کرد، پێش ئەمە بەڕێوەبەری زانکۆی (قورئانی پیرۆز) لە سودان دەعوەتی کردم بۆ مامۆستایەتی لەو زانکۆیەدا، ئینجا پاش سێ مانگ چووم بۆ (خەرطوم)و لەکولیەی (شەریعە) لەو زانکۆیەدا دامەزرام بە مامۆستا.

لە ساڵی (١٩٩٥)دا لەوێ خودا ئەو هەلەی بۆ ڕێکخستم کە بگەم بەو ئاواتەم و، لە سوورەتی (فاتیحە)وە دەستم کرد بە نووسینی، بەڵام کە سەرنجم دا، لێکدانەوەو تەفسیری قورئانی پیرۆز بەو شێوە کورتەی کە من دەمەویست سوودێکی وای نەدەبەخشی، بۆیە پێویستیی بە درێژەپێدان و ڕوونکردنەوەی زیاتر هەبوو.

ئینجا بە یارمەتی خودا دەستم کردەوە بە نووسینی بەشێوەیەك کە نە هێندە کورت بێت، کە ماناو مەبەستی ئایەتەکان بەجوانیی دەرنەکەوێت، نە هێندەیش درێژ بێت، کە لە سنووری خۆی دەرچێت.

لە ساڵی (١٩٩٦)دا باری تەندروستی و خێزانییم وای خواست کە بچم بۆ بەریتانیا، لەوێ لە شاری (برستۆل) نیشتەجێ بووم. پاش ماوەیەك دەستم کردەوە بە نووسین، لەو ئایەتەوە کە لە سودان لێی وەستا بووم، تا ئەوە بوو بە یارمەتی خودا لە ڕۆژی ٢٧ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی ساڵی (١٤٢٠)ی کۆچی کە بەرانبەر بوو بە ڕۆژی چواری مانگی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٠) زاینی لە لێکدانەوەو تەفسیرکردنی دوا ئایەتی قورئانی پیرۆز بوومەوەو، بەوەیش خودا ئەو شەرەفە گەورەی پێ بەخشیم. سوپاس بۆ خودا. تکام وایە خودا لە گوناهەکانم ببورێت و لە ڕۆژی دواییدا لە ڕیزی ڕوو زەردو شەرمەزاراندا دامەنەگرێت و بەخاتر بەر ڕەحمەتو کەرەمی خۆی، وە بەخاتر بەر شەفاعەتی پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ).

# مەنهەجی نوسینم لەم تەفسیرەدا

١- هەوڵمداوە نووسینەکەم زۆر سادەو ڕەوان و ئاشکرا بێت، بە شێوەیەکی وا هەر کەسێك بیخوێنێتەوە، یاخود بۆی بخوێنرێتەوە بە جوانیی لێی تێ بگات، با ئاستی خوێندەواریشی نزم بێت. خۆم دوور گرتووە لەوەی هەندێك وشەی تازە پەیدابوو بەکار بهێنم، لەوانەی کە تازە کەوتونەتە ناو نووسینی کوردییەوەو، ماناکانیان لای زۆربەی خەڵکی ئاشکراو روون نین.

٢- تا بۆم کرابێت وشەی عەرەبیم بەکار نەهێناوە ئەگەر لە بەرانبەریەوە وشەیەکی کوردیم شك بردبێت، بەڵام هەندێك وشەی عەرەبی رەگی لەناو زمانی کوردیدا داکوتیوەو بوەتە وشەیەکی کوردی و، هەموو کوردێك بەکاری دەهێنێت، بە پێچەوانەی ئەو وشە تازانەوە، کە لە بەرانبەر هەندێك وشەی عەرەبیدا هێنراونەتە کایەوە، کە زۆربەی خەڵکی ماناو مەبەستەکانیان نازانن. جا بۆیە بەکارهێنانی ئەو وشە عەرەبیانەی کە شێوەی کوردییان وەرگرتوەو خەڵکی زۆر بەکاریان دەهێنن و پێیان ئاشنان، هیچ ناتەواویی و لەنگیەکی تیادا نیەو، بگرە باشتریشە لەو وشە غەریبە مانا نەزانراوانە.

وەرگرتنی وشە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر لەناو زۆربەی زمانەکانی جیهاندا وەك دیاردەیەکی بەربڵاو وایە، چونکە ئەو وشانە بوونەتە برای یەکترو هەموویان هەر برای یەکتریشن، هەر وەك ئادەمیزادەکان خۆیان دەگەڕێنەوە سەر یەك باوك و دایك و برای یەکترن لە مرۆڤایەتیدا.

زمانی عەرەبی لە زۆریی وشەدا زمانێکی دەوڵەمەندە، کەچی لەگەڵ ئەو دەوڵەمەندیەیدا هەندێك وشەی لە زمانەکانی ترەوە وەرگرتووەو کردوونی بە وشەیەکی عەرەبی، بگرە هەندێك لەو وشە غەیرە عەرەبیە وەرگیراوانە لە قورئانی پیرۆزیشدا هەن، وەکو (زنجبیل)، (سجیل)....

٣- هەوڵم داوە ماناو مەبەستی ئایەتەکان بە روونی و بە کورتیەکی وا بخەمە ڕوو، کەزیان بە ماناکەی نەگەیەنێت و، بە شێوەیەکی وابێت بە ئاسانیی مەبەستەکانی بە دەستەوە بدات. بەڵام ئەگەر بینیبێتم دەرخستنی ماناو مەبەستی ئایەتێك پێویستیی بە زیادە روونکردنەوە و درێژەپێدانێکی زیاتر هەبێت، ئەوە لە درێژەپێدان و روونکردنەوەیدا، ئەوەندەی بە پێویستم زانی بێت ڕەزیلیم نەکردوە.

٤- خۆم لاداوە لەو قسانەی کە هەندێك لە تەفسیرنووسان خستوویانەتە ناو تەفسیرەکانیانەوە، کە دوورن لە راستی یەوەو، لەگەڵ ژیری و بیرو هۆشی تەواودا ناگونجێن و، هیچ دەلیلێکیشیان لەسەر نیە، نە لە قورئانداو نە لە فەرمودەکانی پێغەمبەرماندا(ﷺ) جا ئەو جۆرە قسانە چ ئیسرائیلیات بن، کە هەمووی قسەی هیچ و پووچ و درۆیەکی بێبناغەن، یان غەیری ئیسرائیلیات بن، کە لەگەڵ زانست و تێگەیشتنی نوێ و هاوچەرخدا نەگونجێن.

٥- هەندێك جار ئەو جۆرە قسانەم هێناوەو باسم کردوون، بەڵام ڕەخنەم لێگرتوون و ئەوەی خۆم بە ڕاستم زانیبێت لە تەفسیرەکەمدا نووسیومە، بگرە هەندێك جار درێژەیشم بەو رەخنەگرتن و نووسینانەم داوە.

٦- زەینم داوەتە ئەو ئایەتە پیرۆزانەی، کە بۆ پەندو عیبرەت هەندێك ئیشاراتیان تیادایە بۆ هەندێك باسی زانستیی نوێ، کە پێشتر نەزانراون و عیلمی تازە دەریخستوون، جا لەو ئایەتانەدا هەڵوەستەیەکم کردوەو، کەمێك زیاتر لەسەریان ڕۆیشتووم، بۆ ئەوەی دەربکەوێت کە قورئان لەلایەنی خوداوە نێرراوە، نەك دانراوی پێغەمبەر بێت(ﷺ) چونکە پێغەمبەر لەو سەردەمەدا ئەم باسە زانستیەی نەزانیوە.

بۆ نموونە، سەرنجی ئایەتی ژمارە (٤)ی سوورەتی (قیامة) بدە، کە دەفەرموێت، ﴿بَلَىٰ قَادِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ﴾ (بنان)، سەرەپەنجەکانە. خودا سەری پەنجەکانی ئادەمیزادی بەو بچووکییەی خۆیانەوە بە شێوەیەك

درووست کردوه کە خەتەکانی پەنجەی هەر مرۆڤێک لە دێر زەمانەوە تا ئێستاو تا دنیاش کۆتایی پێ دێت لە خەتەکانی پەنجەی هیچ کەسێکی تر ناکات! ئەمەش زانستی نوێ دەریخستوەو، پێشتر نەزانرا بوو. جا خودای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ئێمە لە ڕۆژی دواییدا نەک هەر دەتوانین هەموو ئەوەی ئادەم زیندوو بکەینەوە، بەڵکو دەتوانین سەرپەنجەی هەموو کەسێك بەو شێوە تایبەتیەی خۆیان، وەکو خۆیان درووست بکەینەوە!

٧- تەفسیری ئەو ئایەتە پیرۆزانەی، کە ئیشارەتێکیان بۆ بەشە جیاجیاکانی ئەم کائیناتە گەورەیە تێدایە، دەبێت بەپێی ئەوە مانایان بکرێت کە وشەی ئایەتەکان دەگەیەنن، نەك بەپێی مەزەندەو خەیاڵێك کە بەڵگەیەکی زانستی تەواوی لەسەر نەبێت. جا منیش وام کردووە، بۆ نموونە: خودای گەورە هەواڵی پێداوین کە حەوت ئاسمانی بەسەریەکەوە درووستکردوە، کە زۆر بەهێزو بە تینن. جا بەپێی فەرمایشتی خودا ئاسمانەکان -بەبێ زیادو کەم- حەوتن، بەڵام ئێمە نازانین کە ئەو حەوت ئاسمانە لەچی درووستکراون؟! چۆنن؟! بڵندییان چەندە؟! نێوان هەر ئاسمان و ئاسمانێکی تر چەندە؟!...هتد.

زانستی ئەستێرە (فەلەك)ناسیی هەر چەندە زۆریش پێشکەوتووە، بەڵام هێشتا هیچێکی ئەوتۆی لە ئاسمانی یەکەم بۆ دەرنەکەوتووە، جا چ جای ئاسمانەکانی تر! ئەوەی زانست دەیزانێت تەنها هەندێك زانیاری یە دەربارەی بە هەندێك ئەستێرەو گەلەئەستێرە کە بە بن ئەم گومەزیە شینەوەن کە بەڕاسەرمانەوەیە، کە مەودای بڵندیەکەی لە خودا زیاتر کەسێکی تر نایزانێت. جا بۆیە نابێت -وەکو هەندێك لە نووسەرانی تازە وتویانە- ئێمەیش بڵێین: مەبەست لەو حەوت ئاسمانە حەوت ئەستێرەیە، کە سەر بە کۆمەڵەی (خۆر)ن و بەستراونەتەوە بە خۆرەوە، وەکو عەتاردو زوحەل و مەریخ... هتد، لە کاتێکدا کە دەرکەوتووە ژمارەی ئەو ئەستێرانە لە حەوت ئەستێرە زیاترە، وەکو (ئۆرانۆس)و (نیپتۆن).

یاخود وەکو هەندێك وتویانە، ئێمەیش بڵێین مەبەست لەم حەوت ئاسمانە، حەوت چین (طبق)ەی هەواو گازە، کە بە دەوری زەویدان، لە کاتێکدا کە ژمارەی ئەو چینانە هەرچەندێك بێت، هەر لە ژێر ئەو ئەستێرەو مەجەرانەوەن، کە خودا دەفەرموێت: ئێمە ئاسمانی یەکەممان پێ رازاندوونەتەوە.

٨- زۆر لەسەر ئەو ئایەتە پیرۆزانە وەستاوم کە باسی دروستکراوەکانی خودا دەکەن، بۆ کەمێك قسەلێکردنیان و دەرخستنی بەڵگەکانی بوون و تاك و تەنهایی و دەسەڵاتی بێ سنووری خودا، کە ئەو گشت شتە سەرسوڕهێنەرانەی دروست کردووە، کە هەموویان شایەتن لەسەر تاك و تەنهایی و توانای بێئەندازەی، کە هەرگیز عەقڵ ڕێگا نادات بووترێت ئەمانە لە خۆیانەوە پەیدا بوون. چونکە ئەگەر تەنها سێ خشت بە ڕێکوپێکی خرابنە سەر یەکتری، کەس باوەڕ ناکات، کە ئەو دانان و خستنە سەریەکە لە خۆیەوە بوو بێت، بەڵکو دەبێت کەسێك ئەو کارەی کردبێت، ئەگەرچی کەسەکە نەبینرا بێت و نەشزانرێت کێیە؟!

بۆ نموونە: ئیشارەتی قورئانی پیرۆز بۆجیاوازی سەرە پەنجەکانی ئادەمیزادەکان، کە هی کەس لە هی کەس ناکات و، هەرگیز دووبارەبوونەوەیان تیادا نیە، ئەمە لەلایەکەوە شایەتە لەسەر ئەوەی، کە ئەم قورئانە پیرۆزە کە ئەم راستی یە زانستیەی تیادایە لەلایەن خوداوە نێرراوە، وەگەرنە پێشتر نە پێغەمبەرو نە کەسێکی تر ئەم راستیەی نەزانیوە، تا لەم دواییانەدا دۆزرایەوە -وەکو وتمان-. هەروەها لەلایەکی تریشەوە شایەت و بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر بوون و توانای بێ ئەندازەی خودای گەورە، کە ئەم پەنجە بچووکانەی چۆن بەو شێوەیە دروست کردووە، کە تەواو جیاواز بن لە پەنجەی ملیارەها ئادەمیزادی ترا بەڕاستیی ئەمە عەقڵی ئادەمیزاد لە بەرانبەر دەسەڵاتی بێ سنووری ئەو پەروەردگارەدا سەرسام دەکات.

٩- کەم جار وابووە چەند ئایەتێکی جزمی پێشوو لە لێکدانەوەمدا دوا بخەم، تا لەگەڵ ئایەتەکانی جزمی دواتردا پێکەوە لێکیان بدەمەوەو تەفسیریان بکەم، بەڵام ئەگەر زانیبێتم، کە ئایەتەکانی کۆتایی جزمێك، لەگەڵ ئایەتەکانی سەرەتای جزمەکەی دواتریدا زۆر بەیەکەوە بەستراونەتەوەو دەربارەی یەك باسن و، بە پچڕاندنیان لە یەك، بۆ ئەو کەسەی ئایەتەکانی ئەو جزمە دەخوێنێتەوە باسەکە دەپچڕێت و فەرمایشتەکە دابڕانی تێدەکەوێت، ئەوە ئایەتەکانی کۆتایی ئەو جزمەم دواخستووە تا لەگەڵ ئایەتەکانی سەرەتای جزمەکەی تردا پێکەوە تەفسیریان بکەم. جا لەو جێگایانەدا ـ کە من ـ دوای ئەو ئایەتانە نووسیوومە ئەم ئایەتانە لە جزمی پێشوودان، بەڵام لەبەر نەپچڕاندنی ماناکان دوام خستوون و لەگەڵ ئەم جزمەدا تەفسیرم کردوون.

ئومێدەوارم ئەوەی کە نووسیوومە لەگەڵ ماناو مەبەستی ئایەتە پیرۆزەکاندا ڕێك و ڕاست و تەواو بێت، خۆ ئەگەر لە جێگەیەکدا بەهەڵەدا چوو بم، ئەوا لە خودای گەورەو میهرەبان دەخوازم لێم ببورێت و بمخاتە بەر لوتف و کەرەمی فراوانی خۆی .

## چەند باسێك دەربارەی زانستەكانی قورئانی پیرۆز

### ١- هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز:

قورئانی پیرۆز وەحی یەو لە لایەن خوداوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هاتووەتە خوارەوە. هاتنە خوارەوەی یەكەم جار لە شەوی (قەدر)دا بووە، كە تەنها پێنج ئایەتی سەرەتای سوورەتی (عەلەق)ە لە جزمی عەممەدا. ئینجا وردە وردە هەر جارەی چەند ئایەتێكی، یان بەشێكی لێ هاتووەتە خوارەوە، تا بە ماوەی (٢٣) ساڵ هەمووی هاتووەتە خوارەوە. لەو (٢٣) ساڵە، (١٣) ساڵ و چەند مانگێكی لە مەككەدا بووەو، (٩) ساڵ و چەند مانگێكیشی لە مەدینەدا بووە. جا هەروەك چۆن بە هەمووی دەوترێت (قورئان) بەهەمان شێوە بە هەموو بەشێك و ئایەتێك و سوورەتێكیشی هەر دەوترێت: (قورئان).

هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز بەو ماوە دوورو درێژە لەبەر چەند حیكمەت و هۆیەك بووە، كە ئەمانە هەندێكیانن:

أ- بۆ ئەوەی بە ئاسانیی لەبەر بكرێت و بە ئاسانییش بەجوانیی بنووسرێتەوە، خۆ ئەگەر هەمووی بەیەك جار بهاتایەتە خوارەوە، هەم نووسینەوەی و هەم لەبەركردنیشی زەحمەت دەبوو.

ب- پێغەمبەر(ﷺ) بە دەست بێ باوەڕان و بتپەرستانی مەككەوە چەندەها جار دووچاری ناڕەحەتیی دەكرا، هەروەها لە مەدینەیشدا جوولەكەكان بەردەوام لە پیلانگێڕاندا بوون لە دژی خۆی و بانگەوازەكەی . هەروەها بتپەرستانی مەككە زۆر ڕەفتاری ناشایستەیان دژ بە موسڵمانەكان -كە هێشتا ژمارەیان كەم بوو- دەنواندو، بە هەموو شێوەیەك ئازاریان دەدان و تەنگیان پێ هەڵدەچنین. جا كە هەر جارێك بەشێك لە قورئانی پیرۆز دەهاتە خوارەوە، هێزی دڵی پێغەمبەرو هاوەڵانی بەهێزتر دەكردو، وایان

لێ دەهات زیاتر لەسەر ئیمان و ئاینەکەیان و ئەو ڕێبازەی کە گرتبوویانە بەر ڕشتو بەردەوام بن.

ج- چەندەها بیروباوەڕی چەوت و پووچەڵ و جۆرەها ڕەوشتی خراپ و ناشیرین لە ناو کۆمەڵگەی مەککەو مەدینەدا باوبوون و، لە ناخی خەڵکەکەدا ڕەگیان داکوتا بوو، بۆیە هەڵکەندن و گۆڕینیان کارێکی هەروا ئاسان نەبوو، بەڵکو پێویستیی بەو ماوەیە هەبوو کە وردە وردە قورئانی تیادا بێتە خوارەوە، تا هەر جارەو بە شێوەیەك خراپیی ئەو بیروباوەڕو ڕەوشتانە بخاتە پێش چاویان و چارەسەری بکات.

د- لەناو کۆمەڵگەی مەککەو مەدینەدا ناوە ناوە چەندین پرسیار پەیدا دەبوون و، پێویستییان بە وەڵامدانەوە هەبوو، یاخود چەندەها ڕووداو ڕوویدەدا کە پێویستیان بە ڕوونکردنەوە هەبوو، جا هەر جارێك کە شتی وا ڕوویبدایە، چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەربارەی ئەو کارو ڕووداوە، یاخود دەربارەی ئەو پرسیارانە دەهاتە خوارەوە. وەکو: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ...﴾، ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ...﴾، ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ...﴾، یاخود وەکو ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا ...﴾ وەڵامی ئەم پرسیارانە، لە دوای پرسیارەکانەوە لە قورئانی پیرۆزدا ڕوونکراونەتەوە.

## ٢- بەشە قورئانی مەککەو، بەشە قورئانی مەدینە:

وەك پێشتر وتمان، قورئانی پیرۆز هەندێکی لە مەککە هاتوەتە خوارەوەو هەندێکیشی لە مەدینە، جا ئەوەی لە مەککە هاتوەتە خوارەوە، پێی دەڵێن: (ئایاتی مەککی)، ئەوەیشی کە لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە، پێی دەڵێن: (ئایاتی مەدەنی). بە شێوەیەکی تر: ئەو ئایەتانەی کە پێش کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە، بۆی هاتبنە خوارەوە پێیان دەڵێن: ئایاتی مەککی،

ە ئەوانەی پاش کۆچکردن بۆی هاتبنە خوارەوە، پێیان دەڵێن: ئایاتی مەدەنی.

هەموو قورئانی پیرۆزیش لە (١١٤) سوورەت پێکهاتووە، کە بە سوورەتی (فاتیحە) دەست پێدەکات و، بە سوورەتی (ناس) کۆتایی پی دێت. سەرجەم ئایەتەکانیشی نزیکەی (٦٤٧٠) ئایەتە، ئەگەر ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ لە هەموو سوورەتەکاندا بە ئایەت دابنرێت.

جیاوازیی نێوان ئەو ئایەتانەی، کە لە مەککە هاتوونەتە خوارەوە، لەگەڵ ئەو ئایەتانەی کە لە مەدینەدا هاتوونەتە خوارەوە لە چەند شتێکدا دەردەکەوێت، لەوانە:

أ- بە زۆریی ئەو ئایەتانەی کە بە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ...﴾، یان بە ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ...﴾ دەست پی دەکەن، ئایاتی مەککین، وەبە زۆری ئەو ئایەتانەی کە بە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ...﴾ دەست پی دەکەن، ئایاتی مەدەنین.

ب- ئایاتی مەککی بە زۆریی کورتن و درێژ نین، بە پێچەوانەی ئایاتی مەدەنی یەوە، کە زۆربەیان درێژن.

ج- زۆربەی ئایاتی مەککی دەربارەی باسی عەقیدەو بیروباوەڕن و باسی دامەزراندنی بناغەی ڕەوشتی چاك دەکەن و، باسی نیزام و یاسای کۆمەڵگەیان تیادا نیە، بەڵام ئایاتی مەدەنی باسی هەموو جۆرە نیزام و یاسایەکی وڵات و کۆمەڵگەیان لەخۆ گرتووەو، زیاتر دەربارەی ئەو جۆرە یاسانەن.

د- هەر سوورەتێك وشەی (کلا) ی تیادا بێت، سوورەتێکی مەککی یە، ئەم وشەیە (٣٣) جار لە (٢٥) سوورەتدا دووبارە بوتەوەو، هەموو ئەو سوورەتانەیش لە نیوەی کۆتایی قورئاندان.

ە- هەر سوورەتێك (سوجدەی تیلاوەی) تیادا بێت، سوورەتێکی مەککی یە.

و- هەر سوورەتێك باسی دووڕووەكانی تیادا بێت، ئەوە سوورەتێكی مەدەنی یەتەنها سوورەتی عەنكەبوت نەبێت. چونكە شاری مەككە هەموو بێ باوەڕو بت پەرست بوون و دووڕووی تیادا نەبوو، وە دووڕووەكان لە شاری مەدینەدا بوون.

ز- زۆربەی ئەو سوورەتانەی، كە باسی بەسەرهاتی گەلانی پێشوو پێغەمبەرەكانیان و، باسی ئادەم و شەیتانی تیادا بێت، ئەوە سوورەتی مەككین.

ح- ئەو سوورەت و ئایەتانەی كە لە مەككە هاتوونەتە خوارەوە، زۆر بەتوندیی هەڕەشە لە بتپەرستان و خراپەكارانی ستەمكار دەكات و، بەزۆریی باسی خراپیەكانی بتپەرستیی و هاوەڵ بۆ خودا بڕیاردان و، ڕەوشتە خراپەكانی بتپەرستان دەكات.

## ٣- نووسینەوەی قورئانی پیرۆز:

ئەو كتێبانەی كە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو هاتوونەتە خوارەوە، یان هیچیان نەماون، یاخود ئەوەی ماوە، وەكو تەورات و ئینجیل زۆر دەستكارییان تیادا كراوەو زیادو كەمیان تیا بردوە، بە پێچەوانەی قورئانی پیرۆز، كە چۆن هاتوەتە خوارەوە، بە هەمان شێوە ماوەتەوەو، هەتا ژیانی دنیا كۆتایی پی دێت هەر دەشمێنێت، بەبێ هیچ گۆڕانكاریی و دەستكاریی كردنێك، چونكە خودا بەڵێنی داوە -كە بەو شێوەی ناردویەتیە خوارەوە- بیپارێزێت.

لێرەدا بە چەند بڕگەیەك باسی نووسینەوەی قورئان و تەورات و ئینجیل روون دەكەینەوە، بۆ دەركەوتنی ئەوەی كە لە پێشەوە وتمان:

ا- قورئانی پیرۆز بە سێ جار نووسراوەتەوە، جارێكیان هەر لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا بوو(ﷺ). جاری دووەم، لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەكری صدیقدا بوو -خودا لێی ڕازی بێت-. جاری سێ یەم، لە سەردەمی خەلیفە عوسمانی كوڕی عەففان دابوو-خودا لێی ڕازی بێت-.

له سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) هەر ئایەتێك بهاتایەتە خوارەوە، زۆر بە چاکیی دەچووە بیری پێغەمبەر ﷺ بەجوانیی لەبەری دەکردو، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دەدا لە لایەن چەند کەسێك لەهاوەڵەکانیەوە -کە خوێندەوار بوون و نووسینیان دەزانی- بنوسرێتەوەو دەنوسرایەوە، هەروەها ئەو نووسەرانەی وەحی لەگەڵ نووسینەوەیشیدا لەبەریان دەکرد، ئەمە جگە لەوەی کە موسڵمانەکانی تریش، کە خوێندەواریان نەبوو، هەر لەبەریان دەکرد. جا ئیتر لەبەرکردنەکەیان زۆر بووبێت، یان کەم. وەئەمە بەم شێوەیە بەردەوام بوو تا هەموو قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە.

بەم پێیە پێغەمبەر(ﷺ) هەموو قورئانی لەبەر بوو، وە هەموویشی نووسرابوبوەوەو ژمارەیەکی زۆریش لە موسڵمانەکان لە مەدینەدا، یان هەموو قورئانیان لەبەر بوو، یان بەشێکی زۆریان لەبەر بوو، وە هیچ صەحابەیەك نەبووە بێ بەش بووبێت لە لەبەرکردنی قورئان، جا یان زۆری لەبەر بووە، یاخود کەم، چونکە خوێندنەوەی هەندێك لە قورئان لە نوێژدا پێویستە.

ب- کە پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ) وەفاتی کرد، ئەبوبەکر بوو بە خەلیفەی موسڵمانان، ئەوەندەی نەخایەند هەندێك تیرەی عەرەب، کە ئیمانیان لاواز بوو و هێشتا بە تەواویی ئیمان لە دڵیاندا جێگیر نەبوو بوو، لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو، هەندێکیان وازیان لە زەکاتدان هێنا. خەلیفە ئەبوبەکریش -خودا لێی ڕازی بێت- خێرا لەشکری ناردە سەریان و لە نێوان موسڵمانەکان و لە ناپین هەڵگەڕاوەکاندا شەڕێکی گەورە روویدا، حەفتا کەس لەو صەحابانەی کە هەموو قورئانیان لەبەر بوو، لەو شەڕەدا کە لەگەڵ (موسەیلەمەی کەززاب)دا روویدا، شەهید بوون. ئەو موسەیلەمە زۆر درۆزنەی کە ئیدیعای پێغەمبەرێتی دەکرد.

لێرەدا عومەری کوڕی خەتتاب بە خەلیفە ئەبوبەکری وت: دەترسم لەمەودوا لە شەڕدا زۆرێك لەو کەسانەی کە قورئانیان لەبەرە شەهید بکرێن، بۆیە پێویستە هەموو قورئان بەیەکەوە لە جێگەیەکدا بنووسرێتەوە، نەك بەو

شێوە جیاجیایە، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) نووسراوەتەوە.

ئەبوبەکر دوای بیرکردنەوە ئەم ڕایەی عومەری پەسەند کرد-خودا لێیان ڕازی بێت- بۆیە بانگی (زەیدی کوڕی ثابت)ی کردو ئەم ئەرکەی خستە سەرشانی، کە لە سەردەمی پێغەمبەریشدا -دروودی خودای لەسەر بێت- ئەم یەکێك بوو لەوانەی قورئانیان دەنووسیەوەو، هەموو قورئانیشی لەبەربوو. ئەبوبەکر بۆ زیادە دڵنیایی، ئەو قورئانانەی کە بەجیا جیا لە سەردەمی پێغەمبەردا نوسرابوبوەوە، هەمووی کۆ کردەوەو خستیە بەردەستی (زەید)، بۆ ئەوەی لە کاتی نووسینەوەکەدا - گەر پێویستی پێیان بوو- بگەڕێتەوە سەریان. زەیدیش بەوپەڕی حەزو شەوقەوە دەستیکرد بە نووسینەوە و هەمووی نووسیەوە. ئینجا ئەم نوسخەیە لای ئەبوبەکر -تا لە ژیاندا بوو- هەڵگیرا، دوای ئەو کەوتە دەست خەلیفە عومەرو پاش ئەویش کەوتە لای خاتو حەفصەی کچی، کە یەکێك بوو لە خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

لە کاتی نوسینەوەکەی زەیددا، چەند کەسێك لە صەحابەکان -کە هەموویان قورئانیان لەبەربوو- ئاگاداریی نووسینەوەکەیان دەکرد، تا نووسینەکە تەواو ڕێکو پێك بێت.

جیاوازیی لە نێوان ئەو قورئانانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) نووسرابوویەوە، لەگەڵ ئەو قورئانەی کە زەید نووسیبوویەوە، ئەوە بوو، قورئانەکەی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) پرژو بڵاوبوو لە جێگەی جیاجیادا نوسرابوبوەوە، بەڵام ئەوەی زەید هەمووی بەیەکەوە بوو، وە وەکو کتێبێك هەمووی بە تەرتیب لەیەك جێگەدا بوو.

ج- لە سەردەمی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففاندا -خودا لێی ڕازی بێت- ئایینی ئیسلام بە هەموو لایەکدا بڵاو بووبووەوە، موسڵمانەکان لە وڵاتە جیاجیاکاندا، کە قورئانیان دەخوێندەوە، وادەبوو لەهجەی ناوچەیەك لە لەهجەی ناوچەیەکی تر جیاوازیەکی دەبوو، حوزەیفەی یەمانی -خودا لێی ڕازی بێت- هەستی بەمە کردو بە خەلیفە عوسمانی ڕاگەیاند، لەبەر

ئەمە خەلیفە عوسمان لیژنەیەکی لە چوار هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) پێکهێنا، کە هەر چواریان قورئانیان لەبەر بوو، یەکێکیان ئەو(زەید)ە بوو، کەلەسەردەمی خەلیفە ئەبوبەکردا هەمووقورئانی نووسیبووەوە، جا خەلیفە عوسمان داوای لە خاتو حەفصە کرد، کە ئەو تاکە نوسخەی قورئانی بداتی، کە لەلای ئەو هەڵگیرا بوو. کە قورئانەکەیان هێنا، ئەویشی دا بە لیژنەکە تا بۆ زیادە دڵنیایی لە کاتی پێویستدا بگەڕێنەوە سەری و بەراوردی بکەن.

١- لیژنەکە دەستیان کرد بەنوسینەوەکە، هەندێك دەڵێن: چوارنوسخەیان نووسیەوە، هەندێکی تر دەڵێن: شەش نوسخە. ئینجا خەلیفە عوسمان خودا لێی ڕازی بێت هەر نوسخەیەکی نارد بۆ وڵاتێك.

وەکو مەککەو شام و کوفەو یەمەن و بەحرەین. ئینجا لەو وڵاتانەدا لەسەر ئەو نوسخانە چەندین نوسخەی تر نووسرانەوەو بە هەموو لایەکدا بڵاوکرانەوەو، بەمەیش خەڵکێکی زۆر هەموو قورئانیان لەبەر کرد.

نووسینەوەی قورئانی پیرۆزو لەبەرکردنی لەناو موسڵمانانداا لە هەر کوێ بوو بن- هەر بەردەوام بووە تا گەیشتوەتە ئەمڕۆ.

سوپاس بۆ خودا ئێستا ژمارەیەکی ئێجگار زۆر موسڵمانی دڵڕوناك لە سەرتاسەری ئەم دنیایەدا هەموو قورئانیان لەبەرە ئەمە جگە لەوەی، کە ژمارەیەکی ئێجگار زۆرتریش هەندێکیان لەبەرە جا لە جزمێکەوە بیگرە تا زیاترو کەمتر، وە هیچ موسڵمانێك نیە کە ئەندازەیەك قورئانی لەبەر نەبێت - جا کەم بێت، یان زۆر- چونکە نوێژکردن بەبێ قورئان خوێندن نایەتە دی . ئەمەیش نیشانەیەکی تری گەورەیی ئەم قورئانە پیرۆزەیە، کە بۆ هیچ کتێبێکی تری ئاسمانی شتی وانەکراوە، نە بە زۆر نووسینەوەو زۆر چاپکردنی، نە بە لەبەرکردنی هەمووی، یان هەندێکی !

٢- جا با بێینە سەر باسی تەورات. تەورات لە سەدەی سیانزەهەمی پێش زایینا واتە (١٣٠٠) ساڵ پێش لە لەدایکبوونی عیسا بۆ موسا پێغەمبەر -

سەلامی خودایان لێ بێت- هاتوەتە خوارەوە. بێگومان ئەم تەوراتە نیە کە ئێستا بە دەست جولەکەکانەوەیە، چونکە ئەوتەوراتە کەبۆ موسا هاتبووە خوارەوە، کە(بوختونەصر) دای بەسەر جولەکەکاندا، دڕاندی و سووتاندی. ئینجا بەچەند سەدەیەك پاش ئەوە مالومەکانیان دەستیانکرد بە کۆکردنەوەی و سەرلەنوێ نووسینەوەی، پاش ئەوەی گەلێك زیادیی و کەمیی و گۆڕانکاریی بەسەردا هاتبوو.

تەورات لە پێنج بەش پێکهاتووە: ئەو بەشەی پێی دەڵێن: سیفری (تەکوین) و سیفری (خروج) پاش موسا بە پێنج سەد ساڵ ئینجا دەستکرا بە کۆکردنەوەو نووسینەوەیان. هەرچی بەشی سیفری (تثنیة)ی پێ دەڵێن، ئەوە حەوت سەد ساڵ دوای موسا کۆکراوەتەوەو نوسراوەتەوە، ئەو دوو بەشەکەی تریشی کە پێیان دەوترێت سیفری (عەدەد)و سیفری (لاویین) ئەمانە نۆ سەد ساڵ دوای سەردەمی موسا، لە سەردەمی (عەزراو نەحمیا)دا کۆکرانەوەو نووسرانەوە. هەروەها لە سەردەمی ئەم دوو مالومەدا چاوگێڕدرا بە هەموو سیفرەکانداو دەسکارییان کرا. هەروەها (٤٤٥) ساڵ پێش لە لەدایکبوونی عیسا -سەلامی خودای لێ بێت- تەورات بە زمانی عیبری نووسرایەوە، بەو شێوەی کە ئێستاکە هەیە.

ئەوەی ئێستاکە بە دەست جولەکەکانەوەیەو پێی دەوترێت (تەلمود) کە بە زمانی عیبریە، واتە: فێربوون. ئەوە دوو بەشە: بەشێکیان پێی دەوترێت (مشنا)و بەشەکەی تریش پێی دەوترێت (جیمارا). مشنا بریتیە لەوەی کە پێی دەڵێن: تەورات و، لەو شەرحانەی کە دوای لەدایکبوونی عیسا بە دوو سەد ساڵ تیایدا کراوە. (جیمارە)یش شەرحی (مشنا)یەو، ئەو شەرح و قسانەی مالومەکانی تیادایە، کە لە سەدەکانی رابردوودا کراون. بۆ زیادە زانیاریی.

لەم بارەوە سەیری کتێبی (تطبیق الشریعة الاسلامیة في البلاد العربیة) بکە، کە لە لایەن (دکتۆر صوفی ئەبوطالب)ەوە دانراوە، کە بەڕێوەبەری زانکۆی قاهیرە بوو.

٢- (ئینجیل)یش ئەگەر دەست تێخستن و گۆڕانکاریی لە تەورات زیاتری بەسەردا نەهاتبێت، ئەوە بێگومان لەو کەمتر نیە، ئێستا کە لای دیانەکان چوار ئینجیل هەیە: ئینجیلی (مەرقس)و (لوقا)و (یۆحەننا)لە یۆنانی یەوە وەرگێراوە، وە ئینجیلی (مەتتا) کە ئەصڵەکەی عیبریە. هەریەکە لەم ئینجیلانە ماوەیەکی زۆر دوای سەردەمی عیسا -سەلامی خودای لێ بێت- نووسراونەتەوەو، هەریەکەیان جیاوازە لەوەکەی تریان. زۆر قسەو وتاری پیاوانی کەنیسەیان تیادایە، کە شایەتن لەسەر دەسکاریی کردن و گۆڕان و زیادو کەم کردنیان.

بەڵام ئینجلێکی تر هەیە، پێی دەڵێن ئینجیلی (بەرنابا) کە راستترین ئینجیلە بە نیسبەت ئەو چوار ئینجیلەی ترەوە. (بەرنابا) یەکێك بووە لە موریدە دڵسۆزەکانی عیسا پێغەمبەر سەلامی خودای لێ بێت- ئەم ئینجیلە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و. لە کتێبخانەی (رۆما)دا دۆزراوەتەوە. لەم ئینجیلەدا ناوی پێغەمبەرمان محەممەد(ﷺ) بەڕاستیی و بە ئاشکرا دیاریی کراوە کە پێغەمبەری خودایەو دێت.

شایەنی باسە لەکاتی خۆی چاپخانەی (مەنار) لە میصر ئەم ئینجیلەی چاپ کرد، بەڵام پیاوانی کەنیسە بە ژمارەیەکی زۆر دەیانکڕی و دەیانسووتاند تا بڵاو نەبێتەوە.

١- وەکو پێشتر وتمان خودا بەڵێنی داوە کە قورئانی پیرۆز بپارێزێت و، فەرمویەتی: ئێمە قورئانمان ناردوەتە خوارەوەو هەرخۆیشمان لە فەوتان و دەسکاریی کردن و زیادو کەم تیاداکردنی دەیپارێزین. بێگومان ئەم بەڵێنەی خودا بە ئاشکراو بەتەواوەتی هاتوەتە دی.

سەرنج بدە ئێستا کە بە ملیاران نوسخەی قورئانی پیرۆز لەناو وڵاتە ئیسلامیەکاندا بڵاو بوەتەوە، مۆزەخانە (متحف)ەکانی وڵاتە ئیسلامیەکان و هی وڵاتانی تریش صەدەها نوسخەی قورئانی پیرۆزیان تیادایە، کە هەر یەکە لە سەردەمێکدا بە دەست نووسراونەتەوە، بەبێ ئەوەی نوسخەیەك لە نوسخە

کۆنەکان وەیا نوسخەیەك لەنوسخە تازەکان وشەیەك، یان پیتێکی تیادا زیادو کەم کرابێت!

ئەگەر لە وڵاتێکدا قورئان چاپ بکرێت، لیژنەیەك لە زانایان پێك دەهێنرێت بۆ ئەوەی چاودێریی چاپکردنەکەی بکەن، نەبادا پیتێك، یان وشەیەکی هەڵەی تێ بکەوێت، تەنانەت دوای چاپ کردنیشی لیژنەیەکی تر، لەسەرەتاوە تا کۆتایی چاوی تێدا دەگێڕن، بۆ دڵنیابوون لەوەی، کە هیچ سەهویەك رووی تێدا نەبێت.

هەروەکو پێشتر باسمان کرد ئێستا لە وڵاتانی ئیسلامییدا بە هەزارەها کەس هەن کە هەموو قورئانیان لەبەرە، بەبێ ئەوەی کەسێکیان پیتێك، یان وشەیەك زیاتر، یان کەمتری لە یەکێکی تریان لەبەر بێت. تەنانەت گەر خوانەخواستە رووداوێکی وا ڕوو بدات (فەرمزەن) کە تاکە یەك نوسخەی قورئانیش لەم سەر زەویەدا نەمێنێت -کە شتی وا مەحاڵە- لەگەڵ ئەوەدا بەهۆی ئەو هەزاران کەسەوە کە لەبەریان کردووە، جارێکی تر قورئان وەك خۆی دەنووسرێتەوەو لە چاپ دەدرێتەوە، بەبێ ئەوەی کەمترین زیادو کەمیی تیادا ڕووبدات.

بێگومان ئەمە بۆ تەورات و ئینجیل نەلواوە، چونکە لەو بڕوایەدام کە هیچ کەسێك لە جولەکەکان، یان لەدیانەکان نیە کە زۆربەی تەورات، یاخود ئینجیلی لەبەر بێت، ئیتر چ جای هەمووی ! بەڵێنی خودا بۆ پاراستنی قورئانی پیرۆز تا دنیا رۆشنایی تیادا بێت بەڵێنێکی بەردەوامەو، هەمیشە قورئان لە دەستکاریی و زیادو کەم کردن پارێزراو دەبێت.

جا ئەو بەڵێنەی تەنها بۆ قورئان دراوەو، هیچ کتێبێکی تری ئاسمانی ئەو بەڵێنەی پێ نەدراوە، چونکە کتێبی پێغەمبەرانی تر -سەلامی خودایان لێ بێت- هەر یەکەیان بۆ کاتێك و سەردەمێکی تایبەتیی و گەل و نەتەوەیەکی دیاریکراو بوون و، بە تێپەڕبوونی ئەو سەردەمە، ئیتر پێویستیش بە مانەوەی ئەو کتێبە نەماوە، چونکە دەبێت کار بەو کتێبەی تر بکرێت، کە لە دوای ئەو [illegible] خوارەوە، ئەویش تا ئەو [illegible] کتێبێکی تر دێتە خوارەوە.

بەڵام قورئانی پیرۆز، کە دوا کتێب و دوا پەیامی خودایە، خودا ناردوویەتی بۆ دواترین پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی بۆ گشت زەمان و سەردەمەکان و بۆ هەموو گەل و نەتەوە جۆراوجۆرەکان و بۆ سەرجەم ناوچەو وڵات و سەر زەمینەکان رووناکیی و رەحمەت بێت هەتا کۆتایی بە ژیانی دنیا دێت. چونکە قورئانی پیرۆز وەکو هەڵهاتنی خۆرو رەواندنەوەی یەکجاریی تاریکایی شەوبوو، بەڵام کتێبەکانی تر بۆ رەواندنەوەی بەشێك لە تاریکایی شەو بوون، وەك چۆن جاران بە مۆم و فانۆس و شتی تر شەو رووناك دەکرایەوە، بەڵام ئێستاکە رووناکایی کارەبا هاتوەتە کایە، ئیتر هیچ پێویستیەك بە ڕووناکی مۆم و فانۆس نەماوە.

## ٤- قورئان لەسەر چی نووسراوەتەوە؟!

نووسینەوەی قورئان یەکەم جار لە سەردەمی پێغەمبەردا بووە(ﷺ) هەر ئایەتێك، یان چەند ئایەتێك هاتبێتە خوارەوە هەروەکو زانیمان، پێغەمبەر فەرمانی داوە بنووسرێتەوە دەڵێن ئەم نووسینەوەیە لەسەر لقی دار خورما، یان لەسەر بەرد، یاخود لەسەر ئێسقان بووە.

بەڵام بەڕاستیی من گومانم هەیە لەم قسە. چونکە چۆن درووستە قورئانی پیرۆز لەسەر ئێسقان بنووسرێتەوە، کە پاك نیە؟! وەیا بەردی تەنکی پانو پۆر چۆن دەستکەوتووە، وە لقی دارخورما چۆن بۆ نوسین دەلوێ، جگە لەوەی شکان و لەتبوون رووی تێدەکاتو نووسینەوەکەی سەری دەفەوتێت.

بەڵی پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ) هەر ئایەتێکی بۆ بهاتایەتە خوارەوە فەرمانی بەنووسینەوەی کردووە، هەندێك لە هاوەڵەکانی خوێندەوار بوون و توانای نووسینیان هەبوو، جا چەند کەسێك لەوانە هەڵدەستان بە نووسینەوەکە. دەگونجێت ئایەتێك هاتبێتە خوارەوەو، وابووبێت شتێکی وا لە بەردەستدا نەبووبێت کە جێگەی نووسینەوە بێت، بە ناچاریی بۆ کاتێکی کەم ئایەتەکەیان لەسەر بەردێك، یان شتێکی تر نوسیبێتەوە، تا دوایی بخرێتە سەر

شتێکی تر کە لەو سەردەمەدا بۆ نووسین بەکار هێنراوە، وەکو پێستەی تەنکی دەباغ کراو، یا شتێك کە شێوەی کاغەزی هەبووبێت.

ئەمە وەکو ئەوە وایە، کە ڕێدەکەوێت کەسێك لە بەر ئەوەی پارچە کاغەزێکی پێ نابێت، بە پەلە ناوی کەسێك، یان شارێك، یان ژمارەی تەلەفۆنێك لە ناو لەپی دەستی خۆیدا دەنووسێت، تا دوایی بیخاتە سەر کاغەزو ناو دەفتەرێك.

دانیشتوانی مەککە پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و پاش هاتنیشی ساڵی جارێك بۆ بازرگانیکردن دەچوون بۆ شام و یەمەن، جاری واش بوو هەر بۆ بازرگانی کردن دەچوونە عێراقیش، کە لەو سەردەمەدا بە دەست فارسەکانەوە بوو، بێگومان ئەو وڵاتانەیش کەسانی خوێندەوارو توانای نووسینیان تێدا بووە، جا لەبەر ئەوە نابێت و ناگونجێت ئەوانە بۆ نووسین شتێکی شێوە کاغەزیان نەبووبێت، ئیتر ئەو شتە هەرچی یەك بووبێت و شێوەی هەر چۆنێك بووبێت، گرنگ ئەوەیە بۆ نووسین بەکاریان هێناوە.

لە وڵاتی میصردا لە دێر زەمانەوە شێوە کاغەزێکیان هەبووە، پێی دەڵێن: (وەرەقی بەردی) کە بۆ نووسین بەکاریان هێناوە، دوور نیە ئەو جۆرە کاغەزە لە ڕێگای بازرگانیەوە گەیشتبێتە وڵاتی شام.

ئینجا دانیشتوانی مەککە کە بۆ بازرگانی چوون بۆ ئەو وڵاتانە، نابێت ئەو شتەی لەو وڵاتانەدا بۆ نووسین بەکار هێنرابێت، ئەوان نەیانگەیاندبێتە شاری مەککە، چونکە وەك وتمان پێش هاتنی ئایینی ئیسلام لە مەککەدا کەسانی خوێندەوارو شارەزا لە بواری نووسیندا هەبوون، بێگومان ئەوانیش پێویستییان بەو جۆرە شتە بووە کە بۆ نووسین بەکاری بهێنن. وەبوونی مرەکەب لەو کاتەدا لە شاری مەککەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێت جۆرە کاغەزێکیشیان هەبووبێت، کە بۆ نووسین گونجاو بووبێت و هەڵگرتنیشی ئاسان بووبێت و جێگەشی زۆر نەگرتبێت و هەوتان بەئاسانی ڕووی

تێنەکردبێت، ئەمە بە پێچەوانەی لقە دارخورماو بەردو ئێسقان، کە هیچ کام لەو سیفەتانەیان تێدا نیە.

جا کە قورئانی پیرۆز نووسراوەتەوە دەبێت لەسەر ئەو جۆرە شتە بووبێت، ئەویش بە بەڵگەی ئەوەی هەرکە ئایەتێك، یان چەند ئایەتێك دەهاتە خوارەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) جێگاکەی دیاری دەکردو دەیفەرموو، ئەمە بخەنە پاڵ فلان ئایەت لە فلانە سوورەتدا. جا ئەمە چۆن دەبێت، ئەگەر نووسینەوەکە لەسەر گەڵای لقی دارخورما، یان بەرد، یان ئیسقان بوو بێت؟!!

لە هەر وڵاتێکدا کاغەز بووبێت و، شێوەی لاپەڕەیی بووبێت و بۆ ئەوە شیا بێت کە شتی تیادا بنووسرێت، لەوکاتەدا لەناومەککەدا هەبووەو بە (قیرطاس) ناویان بردووە.

خودای گەورە دەربارەی بە بەردەوامبوونی بێ باوەڕانی مەککە لەسەر بێ باوەڕیی خۆیان، لە ئایەتی ژمارە (٧)ی سوورەتی (ئەنعام)دا، کە لە مەککە هاتوەتە خوارەوە، بە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَابًا فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾. واتە: ئەگەر ئێمە کتێبێکمان لە قیرطاس لە لاپەڕەیەکدا بۆ بناردیتایەتە خوارەوە، ئەو بێ باوەڕانە بە دەستی خۆیشیان دەستی لێ بدەن، لەبەر بەردەوامییان لەسەر بێ باوەڕیی خۆیان و ئیمان نەهێنانیان، دەڵێن ئەمە سیحرێکی روون و ئاشکرایە. جا ئەم ئایەتە پیرۆزە شایەتە لەسەر ئەوەی کە لەمەککەدا شتێکی شێوە لاپەڕەیی هەبووە، کە بۆ ئەوە شیاو بووە شتی لەسەر بنووسرێت.

لەلایەکی تریشەوە بەشێکی زۆری قورئانی پیرۆز لە مەککەدا هاتوەتە خوارەوە، هەر هەمووی نووسراوەتەوە، جا ئەگەر ئەو نووسینەوەیە لەسەر لقە دارخورماو بەردو ئێسقان بوایە، لە کاتی کۆچکردنی موسڵمانەکان بۆ مەدینە، چۆن دەگەیەنرایە ئەوێ و، چۆن ئەو لقەدارانە ئەدەشکان و نووسینەکانیان نەدەفەوتان؟! خۆ ئەو هەموو بەردو لقە دارو ئێسقانانە باری چەند حوشترێك

دەبوون؟! جا چۆن و لە کوێوە ئەو بارانە گوێزرانــەوە بۆ مەدینە، لە حاڵێکدا کە زۆربەی موسڵمانەکان خۆیان بە پەنهانییەوە کۆچیان کرد؟!

## ریز کردنی ئایەت و سوورەتەکان:

هەموو زانایان لەسەر ئەو ڕایە کۆکن، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆی جێگای یەکە یەکەی ئایەتەکانی قورئانی دیاری کردووە، بەو تەرتیبەی کە ئێستا لە قورئانی پیرۆزدا دەیبینین، ئەو دیاریکردنەیشی لە خۆیەوە نەبووە، بەڵکو لە لایەن خودای پەروەردگارەوە لە ڕێگەی جبرئیلەوە-سەلامی خودای لێ بێت- پێی گەیشتوە. هەر ئایەتێك، یان چەند ئایەتێکی بۆ بهاتایەتە خوارەوە جێگاکەیانی لە سوورەتەکاندا دەستنیشان دەکردو، دەیفەرموو بەو صەحابانەی کە نووسینەوەی قورئانیان پی سپاردبوون: ئەم ئایەتە، یان ئەم چەند ئایەتە لە دوای فلان ئایەت لە فلانە سوورەتدا بنووسنەوە. وەك پێشتریش وتمان.

بەلام تەرتیبی سوورەتەکان بەو شێوەی کە ئێستا لە قورئانی پیرۆزدا دەیبینین، ژمارەیەکی زۆر لەزانایان لایان وایە ئەم تەرتیبەی سوورەتەکان، لە کاتی نووسینەوەی قورئاندا لە سەردەمی خەلیفە ئەبووبەکرو لەسەردەمی خەلیفە عوسماندا -خودایان لێ ڕازی بێت- لە لایەن ئەو صەحابانەوە کە دەیاننوسیەوە، بە ئاگاداریی خەلیفە ئەبوبەکرو خەلیفە عوسمان خۆیان و ژمارەیەك لە صەحابە بەڕێزەکان ئەنجامدراوەو، سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز بەم تەرتیبەی کە هەیە ڕیزکراون.

بەلام هەندێکی تر لە زانایان ڕایان وایە تەرتیبی سوورەتەکانیش هەروەکو تەرتیبی ئایەتەکان لەلایەن پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دیاریکراون، ئەویش بەپێی ئەو تەرتیبەی کە جبرائیل سەلامی خودای لێ بێت- پیشانی داوە، بەپێی ئەو فەرمانەی کە لە خودای وەرگرتووەو شوێنی سوورەتەکانی بۆ دیاری کردووە.

من وا دەزانم ئەم ڕایەی دوایی ڕاسترە، بەڵێ ڕاستە لە کاتی نووسینەوەی قورئانی پیرۆز لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) تەرتیبی سوورەتەکان هەموویان

بەدوای یەکەوە نەبوون، بەڵکو پرژو بڵاو بوون، چونکە نووسینەوەکە شێوەی کتێبیکی وەرنەگرتبوو، وە لە نێوان سوورەتەکاندا پاش و پێش هەبوو، بەڵام هەر سوورەتێك کە تەواو دەبوو، جبرائیل ئەو سوورەتەی تری دیاری دەکرد کە بەدوایدا دەهات، ئیتر بەو پێیە پێغەمبەری خودا قورئانی پیرۆزی لەبەر دەکردو، هەمان تەرتیبیشی بە صەحابەکان رادەگەیاند.

پاش تەواوبوونی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆزو پێش ئەوەی پێغەمبەری خودا کۆچی دوایی بکات، دوو جار لەگەڵ جبرائیلدا -سەلامی خودای لێ بێت- لە سەرەتای قورئانەوە هەتا دوا سوورەتیان پێکەوە خوێندوەتەوە، جا ئەگەر سوورەتەکان تەرتیبێکیان نەبوایە، ئەو خوێندنەوەیە چۆن دەبوو؟!

کۆمەڵێکی زۆر لە صەحابە بەڕێزەکان هەموو قورئانیان لەبەر بووە، بەڵام وەك لە پێشەوە باسمان کرد، لە جەنگی یەمامەدا لەگەڵ (موسەیلەمەی درۆزن)دا حەفتا کەس لەوانەی قورئانیان لەبەر بوو، شەهید کران، جگە لەوان، چەندین صەحابەی تر هەموو قورئانیان لەبەربووە، جا ئەگەر سوورەتەکان و ئایەتەکان -وەکو ئەمەی ئێستا هەیانە- تەرتیبێکیان نەبووبێت، ئەو هەموو کەسە چۆن بۆیان لەبەر کراوە؟!

لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەکرو خەلیفە عوسمانیشدا -خودا لێیان ڕازی بێت- کە هەموو قورئان وەکو کتێبێك لەیەك جێگەدا نووسرایەوە بەپێی ئەو نووسینەوەی کە لە سەردەمی پێغەمبەر نووسرابوو نەنوسرایەوە. چونکە ئەوەی سەردەمی پێغەمبەر پارچە پارچەو تێکەڵ بوو هەروەکو وتمان-، بەڵکو بەپێی ئەو تەرتیبە نووسیانەوە کە لەبەریان بوو، وە بەو شێوەیە لە پێغەمبەری خودایان وەرگرتبوو. ئەویش بە ئاگاداریی خەلیفە ئەبوبەکرو خەلیفە عوسمان و چەندین صەحابەی تری وەکو ئیمام عەلی کوڕی ئەبو طالب و هی دیکەش خودا لە هەموویان ڕازی بێت-.

# ڕێنووس (املاء)ی قورئان

ئایا واجبە ئیملای وشەکانی قورئانی پیرۆز، کە پێی دەڵێن (رسم الخط) بەو شێوەی کە ئێستا لە قورئاندا هەیە، وەکو خۆی بمێنێتەوەو دەستکاری نەکرێت، یاخود درووستە بگۆڕێت و بە شێوەی ئیملای ئەم سەردەمە بنووسرێتەوە؟!

زۆربەی زانایان لەسەر ئەو رایەن، کە واجبە ئیملای وشە قورئانیەکان هەر وەکو خۆیان بمێننەوەو دەستکاریان نەکرێت، وە لە سەردەمی خەلیفە عوسماندا -خودا لێی ڕازی بێت- چۆن نووسراونەتەوە ئێستایش هەروا بنوسرێنەوەو نابێت گۆڕانیان بەسەردا بێت. بەڵام (ئیبن خەلدون)و (قازی ئەبوبەکر)و چەند کەسێکی تر وتویانە درووستە ئەو وشانە بەپێی ڕێنووس (إملاء)یەك بنوسرێنەوە، کە ئێستا لەناو وڵاتانی ئیسلامیدا باوەو بڵاوە چونکە ئەو شێوازە ئیملایە هیچ زیانێکی لێ ناکەوێتەوەو دەستکاری کردنی قورئان نیە، هەروەها دەڵێن لەبەر ئەوەی خوێندەواری نوێ ئاگای لە ئیملای کۆنی قورئان نیە، ئەو وشانە بە هەڵە دەخوێنێتەوە.

شێوازی ڕێنووسی وشەکانی قورئانی پیرۆز، کە لەسەردەمی خەلیفە ئەبوبەکرو خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففاندا -خودا لێیان ڕازی بێت- قورئانی پێ نوسراوەتەوەو، تا ئێستایش هەر بەردەوام وەکو خۆی ماوەتەوە، ئەوەی جیاوازە لەگەڵ ئیملای ئێستادا. بۆ نموونە: ﴿يخدعون﴾، ﴿شيطين﴾، ﴿ضللة﴾، ﴿تجرتهم﴾، ﴿ظلمت﴾، ﴿يموسى﴾، ﴿فحشة﴾، ﴿علمين﴾ ئەو وشانە لە ئیملای کۆنی قورئاندا بەو شێوانە نوسراون، بە پێی ئیملای نوی بەم شێوەیە دەنووسرێن: ﴿يخادعون، شياطين، ضلالة، تجارتهم، ظلمات، ياموسى، فاحشة، عالمين﴾.

له كۆتایی ئەم باسەدا دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت، کە(عیززی کوڕی عەبدولسەلام) کە زانایەکی گەورەو پایەبەرزو خواناسێکی نموونەیی بووە، فەرمویەتی: درووستە قورئان بە پێی ڕێنووسی (ئیملا)ی نوێ بنووسرێتەوە، بگرە ئەوە پێویستیشە، تا ئەو کەسانەی کە شارەزای ڕێنووسی کۆن نین، ئەو وشانە بە هەڵە نەخوێننەوە کە ڕێنووسی کۆنیان جیاوازە لە هی نوێیان. هەروەها دەڵێ: زۆر پێویستە لە هەمان کاتدا پارێزگاریی لەشێوازی ڕێنووسی کۆنی قورئان بکرێت و فەرامۆش نەکرێت، تا هەر بمێنێتەوەو لە هەموو کات و سەردەمێکدا لە پێش چاوی زانایان و شارەزایاندا بە پارێزراویی هەڵبگیرێت.

بۆ زیادە شارەزایی لەم بارەیەوە، سەیری بەرگی دووهەمی کتێبی (مناهل العرفان في علوم القرآن) بکە کە لە لایەن (شێخی زەرقانی)یەوە دانراوە.

## ٥- دووبارە کردنەوەی ئایەت و باسەکانی قورئانی پیرۆز :

خودای بەرزی بێ وێنە هەندێك لە فەرمایشتەکانی خۆی لە قورئانی پیرۆزدا چەند جارێك دووبارە کردوەتەوە، بەڵام هەر جارەی بە شێوەیەك و بە دارشتنێك و لە شێوازێکی جیاواز لەوی تردا، وەك باسی بەسەر هاتی پێغەمبەرانی خودا سەلامی خودا لەسەر هەموویان بێت لەگەڵ قەومەکانیاندا، کە باوەڕیان پێ نەهێناون و یاخیی بوون و، سەرئەنجام خودایش لە ناوی بردوون. هەروەها وەك باسی هاتنی ڕۆژی قیامەت و زیندووکردنەوەی گرۆی ئادەمیزادو لێپرسینەوەیان و، باسی ڕاپێچکردنی بێ باوەڕانی یاخییان بەرەو دۆزەخی بڵێسەدارو، دڵخۆشکردن و شادمان کردنی ئیماندارانی خواناس و چاکەکار بە باخچە ڕازاوەکانی بەهەشتی نەبڕاوە.

ئەم دووبارەکردنەوەیە هەر جارەی لە کاتێکداو بە شێوازێك بۆ پەندو ئامۆژگاریکردن و ئاگادارکردنەوەو ئینزار کردنی بێ باوەڕانی یاخی یە، کە لە کۆن و نوێدا، هەمیشە دژ بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەستاونەتەوەو

هەوڵیانداوە ڕێگا لە گەشەسەندن و بڵاوبوونەوەی بگرن. ئەمە لە لایەك، لەلایەکی دیکەشەوە هەموو دووبارەکردنەوەیەك مایەی دڵدانەوەیەك بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەروەها بۆ سەرجەم هاوەڵان و شوێنکەوتوانی، تا بتوانن بەهێزو تینێکی زیاترەوە لە بەرانبەر هێرشی دوژمناندا خۆیان ڕابگرن.

ئەگەر وتاربێژ (خطیب)ێك لە کۆبونەوەیەکدا وتارێك بدات و، بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر قسەیەکی خۆی نموونەیەك بهێنێتەوە، پاشان لە جێگایەکی ترو لەناو کۆمەڵێك خەڵکی تردا قسەیەکی تر بکات، ئینجا لەوێیش بشێت نموونەکەی پێشووی بگێڕێتەوە، بێگومان گێڕانەوەی ئەو نموونەیە مانای دووبارەکردنەوە نیەو نابێت ببێتە جێگەی ڕەخنە. نموونەی بەرزیش هەر بۆ خودایە.

دووبارەکردنەوەی هەر فەرمایشتێکی خودا لە قورئانی پیرۆزدا بۆ مەبەست و حیکمەتێکە، بە وردبونەوە لەئایەتە دووبارەبووەکان و سەرنجدان لێیان،دەبێت هەندێك لە مەبەست و حیکمەتەکان دەربکەون. بۆ نموونە: خودای گەورە لە سوورەتی (الرحمان)دا چەند جارێك ئایەتی: ﴿فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ی دووبارە کردوەتەوە، کە هەر کام لەو دووبارەبوونەوانە لە پاش باسی نیعمەتێك لە نیعمەتەکانی خوداوە دێت، کە بۆ ئادەمیزادی هێناونەتە دی، جا لەدوای هەر نیعمەتێکەوە دەفەرموێت: ئایا ئێوە باوەڕ بە کام لە نیعمەتەکانی خودای پەروەردگارتان ناکەن و ناکەوێتە پێش چاوانتان؟!

ئەمە وەکو ئەوە وایە، باوکێك بە کوڕە نالەبارەکەی خۆی بڵێت: من تۆم زۆر بە چاکیی بەخێو کرد. ئایا ئەمە چاکە نیە؟! تۆم خستە بەر خوێندن و خەرجێکی زۆرم لەسەر سەرف کردیت تا خوێندنت تەواو کرد. ئایا ئەمە چاکە نیە؟! دوایی ژنم بۆ هێنایت و ماڵم بۆ جیاکردیتەوە. ئایا ئەمە چاکە نیە؟! ئیتر چۆن هەموو ئەمانەت لە پێش چاو نیەو، لە فەرمانم دەردەچیت؟!

## ٦-هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز(أسباب النزول):

ئایا قورئانی پیرۆز چۆن بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەهاتە خوارەوە؟!
هەندێك جار وا دەبوو کارێك، یان روداوێك روویدەداو پێوستیی بە روونکردنەوە هەبوو، ئیتر ئایەتێك، یان چەند ئایەتێك دەهاتە خوارەوەو رووداوەکەی روون دەکردەوە، یاخود هەندێك جار دەربارەی شتێك پرسیارێك لە پێغەمبەر دەکرا، کە پێغەمبەر وەڵامی پرسیارەکەی لەلا نەبوو، خودا وەڵامەکەی بۆ روون دەکردەوە.

زۆر جاریش ئایەتێك، یاخود چەند ئایەتێك دەهاتە خوارەوە، بەبێ ئەوەی نە کارێك روویدابێت و، نە پرسیارێکیش لە پێغەمبەر(ﷺ) کرا بێت، بەڵکو ئایەتەکان بەبێ هۆی هاتنە خوارەوەیان، دەهاتنە خوارەوەو رێگای راستی خودایان روون دەکردەوەو، یاساو دەستووری ژیانیان بۆ بەختەوەرکردنی ئادەمیزاد لە هەر دوو ژیانیدا دەستنیشان دەکرد.

ئەم جۆرەی دوایان زۆرترین بەشی قورئانە. ئایەتەکانی جۆری یەکەمیان (کە هاتنە خوارەوەی قورئانە لەسەر رووداوەکان، یاخود بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان) زۆر نین، بەڵام هەندێك لە زانایان هۆی هاتنە خوارەوەیان بۆ زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئان داناوە، لە حاڵێکدا کە ئەو ئایەتانە لە جۆری دووەمن و بەبێ هۆیەك هاتوونەتە خوارەوە.

هەروەها زۆرێك لەو ئایەتانەی کە هۆی هاتنە خوارەوەیان بۆ دیاری کراوە، دەبینین بۆ هەر ئایەتێك لەو ئایاتانە هەر کەسەو باسی هۆ (سبب)ێك دەکات بۆ هاتنە خوارەوەیان، کە جیاوازە لەو سەبەبەی کە کەسێکی تر باسی دەکات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە لەبەر هیچ هۆیەك نەبووە، بەڵکو بەبێ هۆ هاتوونەتە خوارەوە.

بۆ نموونە، لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ژمارە (٢٢)ی سوورەتی (موجادەلە) وە کە دەفەرموێت: ﴿لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ...﴾ هەندێك دەڵێن، دەربارەی ئەبوبەکری صدیق هاتوەتە خوارەوە. هەندێکی تر دەڵێن: دەربارەی ئەبو عوبەیدەی جەراحە و، هەندێکی تریش دەڵێن: دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی هاتوەتە خوارەوە، هەندێکی دیکەیش پێیان وایە لە بارەی (حاطب ی کوڕی ئەبوبەلتەعە)وە هاتوەتە خوارەوە. مانای ئایەتەکە ئەمەیە: تۆ هیچ کەسێك، یاخود هیچ کۆمەڵێك نابینیت کە ئیمانی تەواویان بە خوداو بە پێغەمبەری خودا هەبێت لەگەڵ ئەو ئیمانەیان خۆشەویستی و یارمەتیدان لەگەڵ یەکێکدا ببەستن کەدوژمنایەتی لەگەڵ خودا دەکەن. هەر چەندە ئەو کەسە باوك، یان کوڕ، یان برا، یان کەسێکی هاوعەشیرەتیان بێت، چونکە هەرگیزئیمانی راستەقینە لەگەڵ خۆشەویستیی دوژمنانی خوداو پێغەمبەری خودا لەیەك دڵدا پێکەوە کۆ نابنەوە، ئیتر خۆشویستنی ئەو کەسە هەر کەسێك بێت، یا خزمێکی زۆر نزیکیش بێت. ئەمە فەرمانێکی خودایە کە نابێت ئیمانداری راستەقینە لەگەڵ دوژمنانی خوداو پێغەمبەردا دۆستایەتیی ببەستێت. ئەم فەرمانەی خودا هەموو موسڵمانێکی خاوەن باوەڕ دەگرێتەوە، نەك هەر تایبەت بێت بە کەسێکی دیاریکراوەوەو مەبەست تەنها ئەو کەسە بێت.

بەڵێ، هەندێك ئایەت هۆی هاتنە خوارەوەیان لەبەر هۆیەکی دیاریکراوو تایبەتیی بووە، بەڵام نەك بەو شێوە زۆرە، کە هەندێك لە موفەسسیرەکان لە تەفسیرەکانیاندا باسیان کردوون. ڕێکدەکەوێت لەلایەن کەسێکەوە پرسیارێك لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرا، ئینجا خودای گەورەیش بۆ روونکردنەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە ئایەتێك، یان چەند ئایەتێکی دەنارده خوارەوە، وەکو ئایەتی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ...﴾، یان ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ

مُرۡسَىٰهَا...﴾، یــــان ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ قُلۡ سَأَتۡلُواْ عَلَيۡكُم مِّنۡهُ ذِكۡرًا﴾، یاخود روداوێـك، یـان كارێـك رووی دەداو پێویـستیی بـە خـستنە ڕووی حـوكمی شەرعی هەبوو، ئینجا خودای گەورەیش ئەو حوكمەی بـە ئایـەتێك، یـاخود بـە چەند ئایەتێكی پیرۆز دەنارده خوارەوەو روونی دەكردەوە، وەكـو: ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ﴾.

هەنـدێك ئایـەتی پـیرۆز، هـەر لـە خوێندنەوەیـدا دەردەكـەوێت كـە هاتنـە خوارەوەی لەبەر هۆیـەك بـووە، جـا ئەگـەر هـۆی هاتنـە خوارەوەكـەی نـەزانین، ئەوە بە هەڵە لە مانای ئایەتەكە دەگەین، وەكو خودای پـەروەردگار لـە ئایـەتی (١٥٨)ی سـوورەتی بەقــەرەدا دەفــەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا...﴾ ئەگــەر هــۆی هاتنــە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە نـەزانرێت، وای لێ وەردەگیرێـت كـە لـە كـاتی حـەج و عەمرەدا حەوت جار (طواف) لە نێوان صەفاو مەروەدا گونـاه نیـە، لـە كاتێكدا ئەم تەوافە نەك گوناه نیە، بەڵكو واجبە، بەڵام زانینی هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایەتەكە ئەم لێ شێوانە دەڕەوێنێتەوە.

هۆی هاتنە خوارەوەكەیشی ئەوەبوو، كە پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بتێك لەسـەر تەپۆڵكـەی (صـەفا) بـوو، كـە پێیانـدەوت: (ئەسـاف)، وە لەسـەر تەپۆڵكەی (مەروە)یش بتێك هەبوو، كە پێیاندەوت: (نائیلە). جا بتپەرستەكان كە لە نێوان ئەو دوو تەپۆڵكەدا هاتووچۆیان دەكـرد، دەسـتیان دەهێنـا بەسـەر ئەو بتانەیاندا. كە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات، موسڵمانەكان ئەو هاتوچۆیەیان لە نێوان سەفاو مـەروەدا بـە لاوە قـورس بـوو، وە بـە گوناهیـان دەزانـی، ئینجا خودای گەورە ئـەم ئایەتـە پـیرۆزەی نـاردە خـوارەوەو پێـی ڕاگەیانـدن، كە ئـەو هاتووچۆ (سەعی)كردنە لە نێوان (صەفا)و (مەروە)دا گوناه نیە، وەكو ئێوە وا ئەیزانن، بەڵكو واجیبە، وەكو پێغەمبەری خودا(ﷺ) روونی كردوەتەوە.

جا منیش لە تەفسیری ئایەتەکاندا نەکەوتومەتە شوێن ڕای ئەو موفەسیرانەی کە هۆی هاتنە خوارەوە بۆ زۆربەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دادەنێن، چونکە وا دەزانم زۆربەی ئەو ئایەتانە کە ئەوان هۆی هاتنە خوارەوەیان بۆ داناون، بەبێ هۆ هاتوونەتە خوارەوە.

## ٧- نەسخ لە قورئانی پیرۆزدا :

مەبەست لە نەسخی ئایەتێك بریتیە لە لابردنی حوکمی ئەو ئایەتە بە حوکمی ئایەتێکی تر کە لە دوای ئەو ئایەتەی پێشووەوە هاتبێتە خوارەوە، یاخود لابردنی حوکمی ئایەتێکە بە ئایەتێکی تر، بەبێ هاتنی حوکمێکی تازە. جا ئەو ئایەتانەی کە حوکمەکەیان لابراوە، پێیان دەوترێت (مەنسوخ) و، ئەو ئایەتانەیش کە دواتر هاتوون و حوکمی ئایەتە پێشووەکانیان لابردووە، پێیان دەوترێت (ناسخ). ئەو ئایەتانەیش کە نەسخیان بەسەردا نەهاتبێت، پێیان دەوترێت (موحکەم).

زۆربەی زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کە خودای گەورە لەبەر هەندێك مەبەست و حیکمەت، حوکمی هەندێك ئایەتی بە هەندێك ئایەتی تر لابردووە، جا هەندێك لە موفەسسیرەکان ژمارەیەکی زۆر لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیان بە نەسخکراو داناوە، بەبێ ئەوەی زۆربەی ئەو ئایەتانە پێویستییان بە نەسخ هەبێت، یان بەڵگەیەك هەبێت لەسەر نەسخ کردنەوەیان. بەڵام هەندێکی تر لە زانایان زۆر بە وردیی سەرنجیان داوەتە ئەو ئایەتانە کەبە مەنسوخ خراونەتە پێش چاو، لە ئەنجامدا ڕوونیان کردوەتەوە، کە زۆربەی ئەو ئایەتانە موحکەمن و مەنسوخ نین.

هەروەها کۆمەڵێکی تر لە زانایانی دێرین و زانایانی هاوچەرخ ڕایان وایە کە لە قورئانی پیرۆزدا هیچ ئایەتێك نەسخ نەکراوەتەوەو، گشت ئایەتەکانی موحکەمن و، حوکمی هیچ ئایەتێك بە ئایەتێکی تر لانەبراوە، یان نەگۆڕاوە. ئەو ئایەتانەیش کە هەندێك لە زانایان بە نەسخ کراویان دادەنێن، ئەوە ئەم کۆمەڵە زانایانە بە شێوەیەك دەیانخەنە ڕوو کە نەسخی بەسەردا نەهاتبێت.

بێگومان ئەگەر نەسخ لە قورئاندا هەبێت، ئەوە لە چوار پێنج ئایەت زیاتر تێناپەڕێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو چەند ئایەتە کەمەیش دەکرێت بە شێوەیەک تەئویل بکرێن کە ئەوانیش نەسخ نەکرابنەوە. جا با لێرەدا چەند نموونەیەک بخەینە پێش چاو، کە ئەو زانایانەی رایان وایە نەسخ لە قورئاندا هەیە، ئەم نموونانە دەکەنە بەڵگەی بۆچوونەکەی خۆیان، تا بیسەلمێنن کە نەسخ لە قورئانی پیرۆزدا هەیە.

أ- دەڵێن: خودای بەرزی بێ وێنە لە ئایەتی (١١٥)ی سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ ...﴾ واتە: هەموو لایەک، چ رۆژهەڵات بێت، یان رۆژئاوا، هەموو هی خودایەو، لە نوێژدا رووبکەنە هەر لایەک هەر درووستە. ئەم ئایەتە بە ئایەتی (١٤٤)ی سوورەتی (بەقەرە) نەسخ کراوەتەوە، کە دەفەرموێت: ﴿...فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ...﴾ واتە: لە نوێژدا رووبکەنە کەعبەو، نابێت رووبکەنە لایەکی تر. جا ئەوانەی کە رایان وایە نەسخ لە قورئاندا نیە، دەڵێن: هیچ دژایەتی و ناسازییەک لە نێوان ئەم دوو ئایەتەدا نیە. چونکە ئایەتی یەکەم بۆ ئەو کەسانەیە کە لە جێگەیەکدان نازانن قیبلە لە کام لاوەیە، ئەو کەسانە بە پێی ئیجتهادی خۆیان رووبکەنە هەر لایەک درووستە. بەڵام ئایەتی دووەم دەربارەی ئەو کەسانەیە کە قیبلەیان لەلا ئاشکرایەو، دەزانن لە کوێوەیە، ئەوانە دەبێت رووبکەنە کەعبە، وەگەرنە نوێژەکەیان درووست نیە.

هەروەها لەم بارەیەوە دەڵێن: پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ) لەگەڵ صەحابەکاندا کە لە کاتی نوێژدا بە فەرمانی خودا رووی خۆیان لە رووکردنە (قودس)ەوە بەرەو (کەعبە) وەرگێڕا، جولەکەکان وتیان، هەروەکو خودا لە ئایەتی (١٤٢)ی سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێت: ﴿...مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ...﴾ واتە: چی وای لێ کردن کە روویان لە قیبلەکەی خۆیان وەربگێڕن،

ئینجا ئایەتی: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ...﴾ هاتە خوارەوە کە تیایدا دەفەرموێت، هەموولایەکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا هی خودایە، چۆنی بوێت، فەرمان دەدات لە نوێژدا روو بکرێتە ئەوی .

ب- دەڵێن ئایەتی ژمارە (١٨٤)ی سوورەتی بەقەرە، کە دەفەرموێت: ﴿...وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ...﴾ ئەمە وا دەگەیەنێت کە بۆ رۆژوونەگرتنی هەر رۆژێکی رەمەزان، دەبێت ژەمێک خواردن بە هەژارێک بدرێت، تا جێگەی ئەو رۆژە رۆژوونەگرتنە بگرێتەوە، ئەمە بە ئایەتی (١٨٥)ی سوورەتی بەقەرە نەسخ کراوەتەوە، کە دەفەرموێت: ﴿...فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ...﴾ کە فەرمان دەدات بە رۆژووگرتن نەك فدیەدان. ئینجا ئەوانی تر لە وەڵامدا دەڵێن: ئایەتی یەکەم نەسخ نەکراوەتەوە، بەڵکو ئەو ئایەتە دەربارەی ئەو کەسانەیە کە زۆر بە زەحمەت دەتوانن بە رۆژوو ببن، جا ئەوانە مەعزەرەتیان هەیەو دەتوانن لە جیاتی رۆژووگرتن، هەر رۆژەی نانی هەژارێك بدەن، بەڵام ئەگەر رۆژووگرتنەکە زۆر زەحمەت نەبێت بۆیان، ئەوە بەپێی ئایەتی دووەم بە رۆژووبوونەکە پێویستە.

ج- خودای گەورە لە ئایەتی ژمارە (١٨٠)ی سوورەتی (بەقەرە)دا دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ...﴾ ئەم فەرمایشتە پیرۆزە وا دەگەیەنێت کە هەر کەسێك مردنی لێ نزیك ببێتەوەو خاوەنی دارایی و سامان بێت، پێویستە وەصیەت بکات بۆ باوك و دایك و خزمە نزیکەکانی . جا ئەو زانایانەی کە لایان وایە نەسخ لە قورئاندا هەیە، دەڵێن، ئەم ئایەتە بە ئایەتی ژمارە (١١و١٢) ی سوورەتی (نساء) نەسخ کراوەتەوە، لەبەر ئەمە وەصیەت بۆ باوك و دایك ناکرێت، چونکە باوك و دایك لە میراتدا بەشدارن، هەروەها بۆ ئەو خزمانەش کە بەشە میراتیان بەردەکەوێت.

بەڵام ئەوانەی کە ڕایان وایە نەسخ لە قورئاندا نیە، دەڵێن: ئایاتی میرات ئەم ئایەتەی نەسخ نەکردوەتەوە، بەڵکو تەخصیصی کردووە واتە سنوورەکەی تەسك کردوەتەوە. بەڵێ ڕاستە وەصیەت بۆ باوك و دایکی خاوەن میرات نیە، بەڵام ئەگەر میراتیان بەرنەکەوێت، وەکو باوك و دایکی غەیرە ئاینی ئەوە وەصیەتیان بۆ دەکرێت.

(ئەبو موسلیمی ئەصفەهانی) کە یەکێکە لە زانا گەورەکانو، ئیمامی رازی لە تەفسیرەکەیدا ئیشارەت بۆ قسەکانی دەکات، ڕای وایە نەسخ لە قورئاندا نیە، دەڵێت: دایك و باوکی موسڵمان لە میراتدا دوو بەشیان هەیە، بەشێکیان ئەوەیە کە خودا لە ئایەتی میراتدا بۆی دیاریکردوون، بەشەکەی تریشیان ئەوەیە کە بە (وەصیەت) بۆیان دیاری دەکرێت.

هەروەها دەڵێت: هیچ ڕێگریێك نیە لەوەی کە باوك و دایکی موسڵمان دوو بەشیان هەبێت، بەشێکیان بە میرات و بەشێکی تریشی بە وەصیەت. لەبەر ئەمە دەڵێت: ئەو ئایەتە نە نەسخی بەسەردا هاتووەو، نە تەخصیصیش کراوە.

د- هەروەها دەڵێن: خودا لە ئایەتی ژمارە (١٠٦)ی سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ...﴾ ئەم فەرمایشتەی خودا بەڵگەیە لەسەر بوونی نەسخ لە قورئاندا، چونکە خودا دەفەرموێت: ئێمە ئایەتێك لاببەین و نەسخی بکەینەوە، ئەوە ئایەتێکی تر کە لەو باشتر بێت، یان وەکو خۆی بێت، دەخەینە جێگاکەی.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم قسەش دەوترێت: ئەم ئایەتە نابێتە بەڵگە لەسەر بوونی نەسخ لە قورئاندا، چونکە (ئایەت) بە چەند مانایەك هاتوە، هەروەکو بە ئایەتی قورئان دەوترێت (ئایەت)، بە هەموو شتێکی گەورەو سەر سوڕهێنەریش دەوترێت (ئایەت). لێرەدا مەبەست پێی ئاینی و شەریعەتی ئیسلامە، کە بۆ پێغەمبەرمان(ﷺ) نێرراوە، بە بەڵگەی ئەوەی خودا لە ئایەتێکی پێش ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ

ٱلْكِتَٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾ واتـه: بێبـاوەڕان لـه خـاوەن کتێبـەکان ـمەبەسـت جولەکـەکان و دیانەکانـه- هـەروەها بتپەرسـتان پێیان ناخۆشەو حەز ناکەن و نایانـەوێت خـودا خێـرو کـەرەمی خـۆی بەسـەر ئێوەدا بڕژێنێـت، کـه مەبەسـت ئـایین و شـەریعەتی ئیسلامە، ئینجا خـودای گـەورە بـەدوای ئـەم ئایەتـەدا دەفـەرموێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ﴾ واتـه: ئێمـه هـیچ شەریعەتێك لانابەین تا شەریعەتێکی تـر لـەجیاتی ئـەو دانـەنێین، کەواتـه لەم ئایەتەدا نەسخ نەسخی ئایەت نیە، بەڵکو نەسخی شەریعەتە.

خودای بەرزی بێ وێنه له ژێر سایەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، کـه ئـایینی سەرجەم پێغەمبـەرانی خودایـه، بـۆ هـەر پێغەمبـەرێك شـەریعەتێکی نـاردوەو، شـەریعەتی هـەر پێغەمبـەرێکی پێشووی بـه شـەریعەتی پێغەمبـەرێکی دواتـر نەسخ کردوەتەوە، تا شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام هـات، کـه دواتـرین شـەریعەتی خودای پـەروەردگارەو، نەسـخی گشـت شـەریعەتەکانی پـێش خـۆی کردوەتـەوە بۆیـه درووسـت نیـه هـیچ ئادەمیزادێـك جگـه لـه شـەریعەتی پـیرۆزی ئیسلام بکەوێتە شوێن هیچ شەریعەتێکی تر.

## ٨- وەرگێڕان (تەرجەمە)ی قورئان :

مەبەست لە تەرجەمە وەرگێڕانی قسەو وتـارێکی نوسـراو، یـان گوتراو لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر، بە شێوەیەکی وا کە بوترێت ئـەو وەرگێـڕراوە وەکو ئەوە وایە کە لێی وەرگێڕدراوە.

ئەگەر وەرگێڕێك کتێبێك لـه زمانێکەوە بـۆ زمـانێکی تـر وەربگێڕێت کە کتێبەکـەی وێنەیـەك بێـت بـۆ ئـەو کتێبـە وەرگێـڕراوە، ئـەوە نـاوی کتێبـە ئەسڵیەکەی بەسەردا دەبڕێت کە وەرگێڕراوە.

ئەمڕۆ وەرگێڕان لە جیهاندا زۆر باوو بڵاوەو ساڵانە هەزاران کتێب وتـار لە زمانـه جیاجیاکانـەوە بـۆ سـەر زمانـەکانی تـر وەردەگێـڕرێن و، کتێبخانـەی

کوردیش لەم بوارەدا بەشێکی بەرکەوتووەو، هەموو کتێبە وەرگێڕراوەکان ناوی کتێبە لێوەرگێڕاوەکانیان (واتە ئەصڵەکە)یان دەخرێتە سەر.

جا تەرجەمەی قورئان بەم مانایەی کە باسکرا جگە لەوەی مەبەستی تەواوی فەرمایشت و فەرمانەکانی قورئانی پیرۆز دەرناخات، درووست نیەو نابێت قورئان تەرجەمە بکرێت، خۆ ئەگەر بشکرێت، هەرگیز درووست نیە ناوی قورئانی لەسەر دابنرێت و بوترێت ئەمە قورئانەو فەرمایشتی خودایە.

چونکە قورئانی پیرۆز تەنها بەو کتێبە دەوترێت کە خودای بەرزی بێ وێنە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری پێشەوا(ﷺ) وە بە زمانی عەرەبی ناردویەتیە خوارەوە، کە بە سوورەتی (فاتیحە) دەست پێ دەکات و بە سوورەتی (ناس) کۆتایی پێ دێت. تەرجەمەی قورئان -نەك لێکدانەوەو تەفسیر کردنی- بە هیچ شێوەیەك درووست نیە، لەبەر گەلێك هۆ، لەوانە:

ا- قورئانی پیرۆز موعجیزەیەکی خودایەو، بە شێوازێك دارێژراوە، کە لەتوانای هیچ کەسێکدا نیە، لە وێنەی ئەو دارشتنە پاراوو جوان و پڕمانا بەرزەی قورئان دابنێت.

لە سەردەمی خۆیدا، عەرەبەکان چەندەها کەسی ڕەوانبێژو قسەزان و زمان زانیان تیادا بوو، کە باوەڕیان بە پێغەمبەری خوداو بە قورئانی پیرۆز نەبوو، خودای گەورە بۆ دەمکوتکردنیان بە فەرمایشتی خۆی لە ئایەتی ژمارە (٣٣و ٣٤)ی سوورەتی (طور)دا پێی فەرمووون: ﴿أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ٣٣ فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ إِن كَانُوا صَادِقِينَ﴾ وە داوای لێکردن کە ئەگەر ئەوان وا دەزانن قورئان دانراوی محەممەدە، دە با خۆیشیان هاوشێوەیەکی قورئان دابنێن ئەگەر ڕاست دەکەن. جا کە نەیانتوانی، ئینجا بە ئایەتی ژمارە(١٣)ی سوورەتی(هود) داوای لێکردن کەتەنها(١٠) سوورەت وەکو سوورەتەکانی قورئان دابڕێژن. ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ...﴾ جا کە ئەمەیشیان پێ نەکرا و پەکیان کەوت، ئینجا بە ئایەتی ژمارە (٢٣)ی

عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ ئەوە بوو ئەمەشیان پێ نەکراو نەیانتوانی هاوشێوەی بچووکترین سوورەتی قورئانی پیرۆز دابڕێژن، بێگومان هەرگیز ئەوە بە کەس ناکرێت و لە توانای هیچ کەسێکدا نیە.

جا ئایا قورئانی پیرۆز کە بەرزیی و بەلاغەت و رەوانبێژیەکەی لەم ئاستە بڵندو مەزنەدا بێت و موعجیزەیەکی ئاشکرای خودا بێت، چۆن دەکرێت بە تەرجەمە هاوشێوەی بۆ پەیدا بکرێت؟! یاخود کام تەرجەمەو وەرگێڕان دەتوانێت لەو ئاستە بەرزو پیرۆزەی قورئان نزیک ببێتەوە؟!

ب- خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز مایەی خێرو بەرەکەتە، چونکە فەرمایشتی خودای پەروەردگارە، پێویستە لە دوو ڕکاتی نوێژدا هەندێکی لێ بخوێنرێتەوە، جا زۆر بێت، یاخود کەم، چەندە زۆریشی لێ بخوێنرێتەوە ئەوەندە خێرەکەی زیاترە، بەڵام ئەگەر وەربگێڕرێت، خوێندنەوەی وەرگێڕراوەکەی خێرو بەرەکەتێکی تێدا نیە، وە ئەگەر لەناو نوێژدا بخوێنرێتەوە، هیچ تام و چێژێکی نیەو مایەی گوناهەو نوێژەکەی پێ بەتاڵ دەبێتەوە.

ج- هەر گەل و نەتەوەیەکی موسڵمان قورئان تەرجەمە بکات بۆ سەر زمانەکەی خۆی و، منداڵ و نەوە نوێیەکانی فێری ئەو تەرجەمەیە بکات، ئەوە سەردەمێك دێت کە نەوەکانی وا دەزانن ئەوەی کە بە دەستیانەوەیە قورئانەو، وا تێدەگەن ئەوەی لەلایەنی خوداوە نێرراوەتە خوارەوە ئەو کتێبە تەرجەمە کراوەیە. جا بۆ بەڵگەی ڕاستیی ئەمە گۆڤاری (ئەزهەر) لە یەکێك لە ژمارە کۆنەکانیدا بڵاوی کردەوە کە موسڵمانەکانی (جاوە) ئەوەی لە قورئان تەرجەمە کرابوو بۆیان، ئەوەیان فێری منداڵەکانیان دەکردو بۆیان دەخوێندنەوەو پێیان لەبەر دەکردن و پێیان دەزانی ئەوە خودی ئەو قورئانەیە کە لە لایەن خوداوە نێرراوەتە خوارەوە.

د- هەر زمانێك كۆمەڵێك پیت و وشەی تیادایە كە شێوەی لە زمانێكی تردا نیە، قورئانی پیرۆزیش گەلێك لەو جۆرە پیت و وشانەی تیادایە، جا ئایا ئەو جۆرە وشەو پیتانە چۆن تەرجەمە دەكرێن، بە مەرجێك هەمان ماناو مەبەستی خۆیان ببەخشن؟! وەكو وشەی (نعم) و (بئس) كە لە چەند جێگەیەكی قورئاندا هاتوون، كە یەكەمیان وشەیەكە بۆ (مەدح) بەكار دەبرێت و، دووەمیشیان بۆ (زەم كردن) بەكار دێت. هەروەها هەندێك پیت لە قورئاندا مەبەستێكی تایبەتیی دەبەخشێت، جا لێكدانەوەی ئەو ماناو مەبەستانە روونكردنەوەیەكی چەند دێرپی دەوێت، ئەمە لە زمانی عەرەبیدا، چ جای لە زمانەكانی تردا!

سەرنج بدە خودای گەورە لە ئایەتی ژمارە (١١)ی سوورەتی (شورا)دا دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ ئەگەر خودا بیفەرمواية: (ليس مثله شيء) ئەمە وای دەگەیاند كە كەس نیە وەكو خودا بێت، یاخود وێنەی خودا بێت، بەڵام بەمە رەنگە كەسێك وای بە خەیاڵدا بێت و بڵێت: بەڵێ راستە خودا وێنەی نیە، بەڵام پلەیەك لەوە بەرەو خوارتر هەیە، كە نزیك بێت لە تواناو هێزو زانیاری ئەوەوە، بەڵام بوونی ئەو (كاف)ە لە وشەی (كَمِثْلِهِ)دا ئەو وەهمە لادەبات، جا ئایا لە كام زمانی جیهاندا پیتێك هەیە كە ئەو مەبەستە زۆر وردەی ئەو پیتی (كاف)ە بگەیەنێت؟!

- لە زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا شێوازی دارشتنەكە بە شێوەیەكە، بە هەندێك زیادە روونكردنەوە نەبێت (نەك بە تەرجەمە) مانای پڕاوپڕو تەواوی خۆی نابەخشێت. ئایا ئەم ئایەتەی سوورەتی (ئیسراء) كە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا﴾ چۆن تەرجەمە دەكرێت؟! چۆن ئەو مەبەستە جوانە بە تەرجەمە پڕاوپڕ دەگەیەنرێت؟! ئەگەر تەفسیر نەكرێت و ماناكەی بە

روونکردنەوەوە لێکنەدرێتەوە، یاخود چۆن سوورەتی ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ﴾ کە کورتترین سوورەتی قورئانی پیرۆزەو لەسێ ئایەت پێکهاتووە، تەرجەمە دەکرێت، لە حاڵێکدا کە ماناو مەبەستێکی زۆر گەورەو پڕ ماناو فراوانی تیادایە، چۆن وشەی (کوثر) -کە (صیغەی موبالەغە)یە لە (کثیر)- تەرجەمە دەکرێت؟! چۆن مەبەستەکەی دەخرێتە روو، ئەگەر بە چەند دێڕێك ماناکەی روون نەکرێتەوە، هەروەها وشەی (ابتر).

و- زۆرێك لە ئایەتە پیرۆزەکان لە مانایەك زیاتر دەبەخشن، جا بۆ دەرخستنی ئەو مانایانە لەیەك ئایەتدا، پێویستە ئایەتەکە بە روونی لێکبدرێتەوەو تەفسیر بکرێت، وەگەرنە ئەو چەند مانایە بە وەرگێڕان (تەرجەمە) دەرنابڕرێن. بۆ نموونە: خودای گەورە لە ئایەتی ژمارە (٤٩)ی سوورەتی (ذاریات)دا دەفەرموێت: ﴿وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾. وەنەبێت جووتەی نێرو مێ هەر لە گیانداراندا هەبێت، بەڵکو لە هەموو شینایی و روەك و دارودرەخت و بگرە لە هەموو گەردیلە (ذرة)یەکی ئەم بونەوەرەدا هەیە، تەنانەت لە کارەباشدا لە شێوەی (سارد -) و (گەرم +)دا هەیە، جا روونکردنەوەی ئەم مەبەستە لەو ئایەتە پیرۆزەدا چۆن بە تەرجەمە دەکرێت؟! بێگومان روونکردنەوەی ئەو ماناو مەبەستە پێویستیی بە تەفسیرکردن و درێژەپێدان هەیە.

ز- جا کەواتە وەرگێڕان (تەرجەمە)ی قورئانی پیرۆز، جگە لەوەی کە درووست نیە، چونکە فەرمان و فەرمایشتی خودایە، خودی تەرجەمە کردنەکەیش کارێکی مەحاڵەو لە توانای هیچ کەسێکدا نیەو هەرگیز ناکرێت. ئەو تەرجەمانەیش کە کراون جا بۆ هەر زمانێك بێت و با خاوەنەکەیشی موسڵمان بێت ماناو مەبەستەکانی قورئان بە جوانیی و بە تەواویی ناگەیەنن و، پڕن لە لاری و گێرەی و هەڵەی گەورەو بچووك.

تا ئێستا قورئانی پیرۆز نزیکەی (١٥٠) تەرجەمەی کراوە بە نزیکەی (٤٠) زمانی جیا جیای جیهانی . زۆرێك لەو تەرجەمانە پڕن لە درۆو هەڵەی زەق و گەورە، چونکە زۆربەیان لەلایەن دوژمنانی ئیسلامەوەو بۆ چەواشەکاریی تەرجەمە کراون. تەنها بۆ نموونە، یەکێك لەو تەرجەمە خراپ و پڕ هەڵانە، هی (جۆرج سیل)ە کە وەرگێڕێکی ئینگلیزییەو، زیاتر لە (٢٥) جار چاپکراوەتەوە!

پیاوێك بە ناوی (یەعقوبی کوڕی صلیبی) کە (مطران) و دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام بوو، وا پیشان دەدات کە هەندێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بە زمانی سریانی لە سەدەی (١٢)ی زاینیدا تەرجەمە کردووە، وە بە کورتکراوەیی لە ساڵی ١٩٢٥ دا لەسەر نوسخەیەك کە لە مەتحەفی بریتانیادا هەیە، بلاوکراوەتەوە.

زانای پایە بەرز (عەبدوڵڵای زەنجانی) لە کتێبی (تأریخ القرآن)ەکەیدا دەڵێت: ڕەنگە یەکەمین تەرجەمەی قورئان بە زمانی لاتینی لە ساڵی (١١٤٣)ی زاینیدا لەلایەن (کەنت)ەوە کرابێت، کە بە یارمەتی (بوطرسی طوبطلی) کە کابرایەکی عەرەبی زان بووە، تەرجەمەی کردووە. ئینجا ئەو تەرجەمەیە لە ڕێگای (ئەندەلوس)ەوە گەیشتوەتە ئەوروپا. شایانی باسکردنە مەبەستی سەرەکی لەو تەرجەمەیە ڕەخنەگرتن و بەگژاچوونەوەو خراپ پیشاندانی قورئانی پیرۆز بووە.

هەروەها ناوبراو دەڵێت: لە ساڵی (١٥٠٩)ی زاینیشدا قورئانی پیرۆز تەرجەمە کرا بۆ لاتینی، بەڵام ڕێگەی بلاوبوونەوەی پێ نەدرا، چونکە تەرجەمەکە تا رادەیەك خراپ نەبوو! و لە ساڵی ١٥٩٤ یشدا (هەنکلمان) تەرجەمەیەکی قورئانی ئامادە کردو، لە ساڵی (١٥٩٨)بەگژهاتن و ڕەخنە لێگرتن لەچاپ درا.

ج- بێگومان پێویستە قورئانی پیرۆز لەلایەن موسڵمانانەوە رابگەیەنرێت بە گەلانی ناموسڵمان و بە زمانی خۆیان تێبگەیەنرێن، بەڵام نەك بە تەرجەمە کردنی، چونکە وەك باسمان کرد درووست نیەو ناکرێت، بەڵکو

به تەفسیر کردن و لێکدانەوەی بە شێوەیەك ماناو مەبەستی ئایەتەکان بە جوانیی و بە ئاسانیی و بە روونیی بخرێتە روو بۆیان، بەبێ زیادەو درێژە پێدان و، بەبێ کورتی یەکی وایش، کە ببێتە مایەی لەنگی و ناتەواویی بۆ مانای ئایەتە پیرۆزەکان.

بێگومان ئەمەیش زۆر پێویستە، چونکە خودای گەورە گەیاندنی ئایینی ئیسلامی پیرۆزی بە کەسانی ناموسڵمان فەرز کردووە. جا ئەو موسڵمانانەی کە شارەزای ئایینی خودان و دڵیان بە رووناکی قورئانی پیرۆز رۆشنەو تێکەڵ بە گیان و ناخیان بووەو زمانی گەلانی تر بە چاکیی دەزانن، دەبێت ئەم ئەرکە پیرۆزە بخەنە سەرشانی خۆیان و لەم بوارەدا درێغی نەکەن.

ئەمە لەم کاتو رۆژەدا جیهادێکی روون و ئاشکرایە، چونکە دەتوانن گەلانی ناموسڵمان بە ئایینەکەی خودا ئاشنا بکەن، چونکە ئەو گەلانە خۆیان، یان هیچی لێ نازانن، یاخود گەر شتێکیشی لێ بزانن بە خراپیی لێی تێگەیەنراون، چونکە دڵرەشانی دوژمنی ئیسلام هەمیشە هەوڵیان داوەو بەردەوام هەوڵیش دەدەن کە قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی هەڵە بخەنە پێش چاوان و، خەڵکانی ناشارەزا چەواشە بکەن، وەپێغەمبەری خوداو موسڵمانەکان بەگشتی بە شێوەیەکی ناشیرین نمایش بکەن و بەجێگەی مەترسی و کەسانی دواکەوتوو لە قەڵەمیان بدەن، تا خەڵکی شوێنی ئایینی ئیسلام نەکەون.

نووسەری ناوداری ئینگلیزی (بەرنادشۆ) لە ساڵی (١٩٣٣)دا لە گۆڤاری (دای موسلیم رفیو)دا دەڵێت: (سەرپەرشتانی کەنیسە چەند چەرخێك لەمەوپێش ئایینی ئیسلامیان بە شێوەیەکی زۆر خراپ و ناشیرین پیشان داوە، جا یان لەبەر تێنەگەیشتن و ناشارەزایی خۆیان لە ئایینەکە بووە، یا خود لەبەر ناحەزیی و رق لێبوونیان لە ئایینەکە بووە. ئەوەش کە وای لێکردون زۆر رقیان لە محەممەدو ئایینەکەی بێت، ئەوانە وایانەزانی (محەممەد) دوژمنی (عیسا)یە. بەڵام من زۆر بەچاکیی مێژووی ئەم پیاوە عەجایبەم

خوێندومتەوەو، بۆم دەرکەوتووە کە ئەم پیاوە دوور بووە لەوەی دوژمنی عیسا بێت، بەڵکو پێویستە ئەم پیاوە بە ڕزگارکەری مرۆڤایەتی دابنرێت).

جا ئەگەر قورئانی پیرۆزو ئەم ئایینە شیرینەی خودا بە جوانیی و بەشێوەیەکی درووست و تەواو بە گەلانی جیهان رابگەیەنرێت، بێگومان زۆری پی ناچێت زۆر کەس لەناو ئەو گەل و نەتەوانەدا رووناکی ئیسلام دڵیان رۆشن دەکاتەوەو ئیمان دەهێنن و، ئینجا ئەوانە خۆیان دەبنە مایەی خێرو بەرەکەت بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئایینی ئیسلام بە وڵاتەکانی خۆیاندا.

من وا دەزانم تەفسیرکردن و لێکدانەوەی قورئان، جا بە هەر زمانێك بێت، بە تایبەتیی جگە لە زمانی وڵاتانی ئیسلامیی، چاکتر وایە لە لایەن لیژنەیەکی شارەزاوە بکرێت، کەلە سی کەس کەمتر نەبن، هەروەها پێویستە ئەو لیژنـە لە ژێر سەرپەرشتیی و چاودێریی دەزگاو ناوەندێکی ئایینی بەرزی وەکو (ئەزهەر)دا بێت، تا بە هەموو شێوەیەك یارمەتی لیژنەکە بدات و ئاسانکاریی بۆ بکات، تا لێکدانەوەکە لە هەڵەو کەموکورتی بەدوور بێت، هەروەها پێویستە لەسەر سەرۆکانی وڵاتانی ئیسلامیی ئەرکی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەو تەفسیرو لێکدانەوە بگرنە ئەستۆی خۆیان و بە وڵاتانی جیهاندا بڵاویان بکەنەوە تا بگەنە دەستی هەموو کەسێك، جا یان وەکو دیاری ببەخشرێت تا زۆرترین ژمارەی لێ بڵاو ببێتەوە، یاخود نرخێکی رەمزیی و کەمی لەسەر دابنرێت.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾

---

# سووڕەتی (فاتیحە)

**ئەم سوورەتە ( ٧ ) ئایەتەو لە مەککە هاتوەتە خوارەوە**

ئـەم سـوورەتە سـوورەتی(فاتیحـە)ی پـێ دەوترێـت، چـونکە لـە سـەرەتای سـوورەتەکانی قورئانەوەیـە، هـەروەها (السبع المثـاني)یشـی پـێ دەوترێـت، چونکە بە ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ەوە کەیەوە، لە حەوت ئایـەت پێکهاتووە، لـە نوێـژدا دووبـارە دەکرێتـەوە، هـەروەها (ام الکتـاب)یشـی پـێ دەوترێـت، چونکە ئەم سوورەتە سەرجەم مەبەستەکانی قورئانی پیرۆزی لـەخۆگرتوە. وەکو:

١- تاکو تەنهایی و خاوەنداریێتی خـودای بـەرزی بـێ وێنـە بۆئـەم بوونـەوەرە بەرفراوانە.

٢- دابەشکردنی هیدایەت و رەحمەتی خودا بەسەر گشت گیانلەبەرانـدا.

٣- مـوژدەدان بـەو کەسـانەی کـە لـە ژیانیانـدا ڕێگـای ڕاسـت دەگرنەبـەر، هەڕەشەکردنیش لەو کەسانەی کە بە پێچەوانەی فەرمانەکانی خوداوە لە ژیانیاندا ڕەفتار دەکەن.

٤-بەندایەتیکردن بۆ خوداو، پشت بەستن تەنها بەو.

٥-داواکردن لە خودای میهرەبان بۆ ڕێنمایی کردن و پیشاندانی ڕێگای ڕاست ڕێگای خوداپێداوان، نەك ڕێگای سەرلێشێواوان و ڕێگای ئەوانەی کە لەبەر خراپییان کەوتونەتە بەر غەزەبی خودا.

ئەم سورەتە لەکاتێکی زۆرنزیك لەهاتنـە خـوارەوەی سـوڕەتی﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾دا هاتوەتـە خـوارەوە سـەبارەت بەگـەورەیی ئـەم سـوورەتە، (ئەبو سەعیدی کوڕی ئەلوعـەللا) دەیگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) پێی فەرمووە: گەورەترین سـوورەتت فێـر دەکـەم، کـە حـەوت ئایەتـەو لەنوێژدا دووبارە دەکرێتەوە. ئەم سوورەتە پیرۆزە لە مەککە هاتوەتە خوارەوە نوێژ بەبێ خوێندنی ئـەم سوورەتەدرووست نیـە. (عوببـادەی کـوڕی صامت) کە یەکێکـە لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت: پێغەمبـەری خـودا فەرموویەتی: (لاصلاة لمن لم یقرأ بفاتحة الکتاب) واتـە: هەرکەسـێك ئەم سوورەتە لە نوێژەکەیدا نەخوێنێتەوە ئەوە نوێژەکەی درووست نیە.

هەموو موسڵمانان لەسەر ئەو ڕایە کۆکن، کە خوێندنی سوورەتی فاتیحە لە نوێژدا فەرزە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ هەموو هـاوەڵانی و ئەوانـەیش کە پاش ئەوان هاتوون، کە بە (تابعین) ناسراون، هەروەها سەرجەم زانایانی ئیسلام، هـیچ کاتێـك بـەبێ خوێنـدنی ئـەم سـوورەتە نوێـژیان نـەکردوە. ئیمامی بوخاری لە (ئـەبو قـەتادە)وە دەیگێڕێتەوەکـە پێغەمبـەر(ﷺ) ئەم سوورەتەی لە هەموو ڕکاتێکی نوێژدا دەخوێندەوە.

هیچ گومانێك لەوەدا نیـە کـە ئایـەتی ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئایەتێکە لـە قورئـان و، بەشـێکە لـە ئایـەتی ژمـارە (٣٠)ی سـوورەتی (نـەمل) کـە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بـەڵام ئایـا ئـەم ئایەتە ئایەتێکە لە هـەموو سوورەتەکانی قورئـان کـە لـە سـەرەتایانەوەیە؟

کۆمـەڵێکی زۆر لـە زانایـان و قورئانخوێنـانی گـەورەی مەککـەو کوفـەو، کۆمـەڵێکی زۆریـش لـە صـەحابەکان و ئەوانـەیش کـە لـە پـاش ئەوانـەوە هاتوون، هەروەها ئیمامی شافیعی و شوێنکەوتوانی و ئیمامی ئەحمـەدیش لە رایەکیدا، رایان وایە کە ئەم ئایەتە بەشێکە لە هەموو سوورەتێك لە سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز، کە ژمارەیان (١١٤) سوورەتە، تەنها سوورەتی (بەرائـە) نـەبێت، بـەڵام ئیمـامی مالیـك و ئیمـامی ئەبوحەنیفـەو شوێنکەوتوانی و هەندێك لە زانایانی شام، لایان وایە کە ئەم ئایەتە بەشێك نیە لە هەموو سوورەتەکانی قورئـان، بـەڵکو ئایـەتێکی تایبـەتی یـەو بۆ جیاکردنەوەی سوورەتەکانە لە یەکتری و بۆ دیاریکردنی نێوان سوورەتەکان هاتوەتە خـوارەوە.هەنـدێکی تـر لـە زانایـان دەڵێن، لـە سوورەتی فاتیحـەدا، بەئایەتێك حیسابە، بەڵام لە سوورەتەکانی تردا وانیە. ئەوانـەی کـە دەڵێن: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ...﴾ ئایەتێکـە لـە هـەموو سـوورەتەکان بەڵگـەیان زۆرەو، بەڵگەکانیشیان زۆربەهێزە. چونکە قورئانی پیرۆز لە سەردەمی ئەبوبـەکری صـدیق دا نوسـرایەوە، هەروەهالەسـەردەمی خەلیفـە عوسمانیشـدا چـەند نوسخەیەکی لـێ نوسـرایەوە، جا لـەو نوسـینانەوەدا ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ...﴾یـان لـە هـەموو سـوورەتەکاندا وەکـو ئایـەتێك نووسـیوەتەوە، تـەنها لـە سـوورەتی (بەرائـە)دا نـەبێت، ئەمـەش بەدرێـژایی سـەردەمەکان و تـا ئێسـتایش لـە هەموو نوسینەوەو چاپێکی قورئاندا هەروا ماوەتەوە.

جا ئەگەر﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ...﴾ ئایـەتێك نەبوایـە لە هـەموو سوورەتەکاندا، چۆن هاوەڵانی پێغەمبەر دەیانخستە پێش هەموو سوورەتێك و دەیاننوسیەوە؟!

ئیمامی ئـەبوداود دەیگێڕێتـەوە، کـە ئیبن عـەبباس وتویـەتی، پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) نێـوانی سـوورەتێك و سـوورەتێکی تـری بـۆ دەرنـەدەکـەوت تا﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ نەهاتایەتە خوارەوە.

بۆیـە نابێـت هـیچ گومانێـك لـەوەدا هـەبێت کـە﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئایەتێکە لەئایەتەکانی سـوورەتی(فاتیحـە). جـابری کـوڕی عەبـدوڵڵا دەڵێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی وتم، چۆن دەست دەکەی بە نوێژ؟ مـنیش وتم،

بە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ...﴾ خوێندن دەست پێدەکەم. ئینجا پێغەمبەری خودا فەرمووی: نەخێر، بە ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ دەست پێ بکە.

ئەبوهورەیرە دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: جبرائیل هات نوێژی فێرکردم و، بە﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بە دەنگی بەرز دەستی پێکرد. خودای بەرزی بێ وێنە لە ئایەتی (٨٧)ی سوورەتی (حیجر)دا دەفەرموێت:﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى ...﴾ مەبەست لەم سوورەتی فاتیحەیەو، سوورەتەکەش بە﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ...﴾وە دەبێتە حەوت ئایەت.

لەدایکی موسڵمانان خاتوو (ام سلمة)وە دەگێڕنەوە کە پرسیاری لێکراوە سەبارەت بە قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەر لە نوێژدا چۆن بووە؟ لەوەڵامدا وتویەتی: یەك بە یەك ئایەتەکانی دەخوێندەوەو دەیفەرموو:﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ...﴾، ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، پێغەمبەر(ﷺ) هەندێك جار لە نوێژدا ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ...﴾ی بە دەنگێکی بڵند دەخوێندەوە و هەندێك جاریش بە دەنگێکی نزم، بەڵام بەزۆریی بە دەنگی بەرز خوێندویەتیەوە.وەك پێشتر باسمان کرد، بەبێ خوێندنی فاتیحە نوێژ نایەتە دی، ئینجا ئەو کەسەی دەیەوێت نوێژ بکات پێش ئەوەی دەست بکات بە فاتیحە خوێندن، سونەتە (استعاذة) بکات، واتە: بڵێت: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾.

خودای بەرزی بێ وێنە لە ئایەتی ژمارە (٩٨) ی سوورەتی (نەحل)دا دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾، واتە: ئەگەر ویستت قورئان بخوێنیتەوە، ئەوە خۆت لە شەیتانی نەفرەت لێکراوو دوورخراوە لە رەحمەتی خودا، بپارێزە.

زانایان دەفەرموون ئەم خۆپاراستنە لە شەیتان، لە هەموو کاتێکی قورئان خوێندندا - جا لە ناو نوێژدا بێت، یان لەهەر کاتێکی تردا- هەر سوننەت و پەسەندکراوە، بەڵام فەرز نیە.

خاوەنی تەفسیری (المحرر الوجیز) - کە (ابن عطیة)یە- دەڵێت: ئیبن سیرین (کە لە ساڵی ١١٠ی کۆچیدا وەفاتی کردووە) و ئیمامی نەخەعی (کە لە ساڵی (٩٦)ی کۆچیدا وەفاتی کردووە) و هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: وتنی ﴿أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ لە پێش هەموو ڕکاتێکی نوێژدا سوننەتە. ئیمام ئەبوحەنیفەو ئیمامی شافیعی تەنها لە ڕکاتی یەکەمی هەموو نوێژێکدا بە سوونەتی دەزانن، نەك لە هەموو ڕکاتەکاندا(ئیمامی مالیك)یش لە نوێژی فەرزدا بە سوونەتی دانانێت، بەڵام لە شەونوێژی ڕەمەزاناندا بە سوننەتی دادەنێت.

ئینجا پاش ئەو باسە، با بچینە خزمەتی لێکدانەوەو ماناکردنی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە پیرۆزە:

١- ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾بە ناوی خودای خاوەن کەرەم و ڕەحمەتی بێ ئەندازەوە -کەهیچ گیانلەبەرێك لێی بێبەش نیە- دەستدەکرێت بە هەموو کردارو گوفتارێك، ئەو خودایەی کە سەرچاوەی بەخشینی بێ کۆتایی یەو ڕەحمەتی تەواوبوونی بۆ نیە.

ئەم فەرمایشتە ڕێنمایی کردنە بۆ ئەوەی کە دەبێت هەموو گوفتارو ڕەفتارو کردەوەیەك تەنها بە ناوی خوداوە دەست پێبکەین، نەك بە ناوی کەسێکی ترەوە. (الرحمن) ئەو زاتەیە کە کەرەم و ڕەحمەتی لێ ڕوو دەدات و دەیبەخشێت. وشەی (الرحيم)یش سەرچاوەی ئەو ڕەحمەتە دەگەیەنێت کە تەواوبوونی بۆ نیە.

٢- ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ سوپاس و ستایش بۆ خودایە کە خولقێنەرو پەروەردگاری هەموو دروستکراوەکانی ئەم بوونەوەرەیە، چ گیانلەبەر بن، یاخود بێگیان.

٣- ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ پێشتر باسی مانای ئەممان کرد. خودای بەرزی بێ وێنە لێرەدا ئەم فەرمایشتەی خۆی دووبارە کردەوە، تا بزانرێت خاوەنێتی خودا لەم گەردوونەدا خاوەنیەتی لوتف وکەرەم لەگەڵ کردنە، نەک خاوەنێتی غەزەب و ئازاردان. هەروەها تا بزانرێت پەروەردگارێتی خودا بۆ جیهان وەنەبێت لەبەرئەوە بێت کە خۆی پێویستیی پێی بێت، چونکە ئەو پێویستیی بە هیچ شتێك نیە، بەڵکو پەروەردگارێتیەکەی ئاسەواری کەرەم و رەحمەتی خۆیەتی. ئەوەش رێنمایی کردنێکە بۆ گشت ئادەمیزادێك بە موسڵمان و ناموسڵمانەوە- بۆ ئەوەی دڵسۆزی یەك بن و دەستی هەموو جۆرە یارمەتی یەك بۆ هەموو کەسێك درێژ بکەن کە پێویستیی بە یارمەتیدان هەبێت. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (انما یرحم الله من عباده الرحماء) بێگومان خودا بە کەرەم و رەحمی خۆی تەنها روو دەکاتە ئەو بەندانەی کە خاوەن رەحم و بەزەیین، جا چ لەگەڵ ئادەمیزادێکی تر خاوەن بەزەیی بن، یان لەگەڵ هەر گیانلەبەرێکی تردا.

٤- ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ ئەو خودایەکە خاوەنی رۆژی دواییە (واتە: رۆژی قیامەت) ئەورۆژەی کە جگە لە خودا کەسێکی تر تیایدا خاوەنی قسەو بڕیارو توانا نیە. لەو رۆژەدا ئەو کەسانەی کە لە ژیانیاندا رێگای راستیان گرتووەتە بەرو بەپێی فەرمان و بڕیاری خودا ژیانیان بردوەتە سەر، خودا دەیانخاتە بەر رەحمەتی خۆی و زۆر بە چاکیی پاداشتیان دەداتەوە، ئەویش بەوەی دەیانخاتە بەهەشت و دڵخۆش و بەختەوەریان دەکات. ئەوانەیش کە لە ژیانیاندا پشتیان کردوەتە بڕیارو فەرمان و فەرمایشتەکانی خوداو خراپەکارن، ئەوە بەرووڕەشیی لە دۆزەخدا سزای خۆیان وەردەگرن.

٥- ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ خودایە! تەنها بەندایەتی بۆ تۆ دەکەین، وە لەتۆ زیاتر ملکەچی کەسی تر نابین. هەروەها جگە لە تۆ پەنا بۆ هیچ کەس و هیچ شتێکی تر نابەین، جا چ زیندوو بێت یان مردوو، چونکە لە تۆ زیاتر کەسێکی تر نیە کە خاوەنی دەسەڵات و توانای رەها بێت لەم

بوونەوەرەدا، یاخود هێزێکی تر نیە کە زیانگەیاندن یاخود قازانجگەیاندنی کەسێکی تری بە دەست بێت.

٦- ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴾ واتە: خودایە! ڕێگای ڕاستمان لە ژیاندا پیشان بدەو لەبەرچاومان ڕووناکی بکەرەوەو، یارمەتیمان بدە بۆ شوێنکەوتنی .

خودای میهرەبان ڕێگای ڕاستی ژیانی بە چەند جۆرە هیدایەتێك بۆ ڕوون کردووینەتەوە، یەکێکیان هیدایەتی ئیلهام و فیترە (غەریزە)یە، یەکێکی تریان هیدایەتی هەست و حەواسەکانە، ئەم دوو هیدایەتەی داوە بە هەموو گیانلەبەرێك و، بگرە لە گیانلەبەرانی دیکەدا لە ئادەمیزاد بەهێزترن. بەڵام دوو هیدایەتی تری بەخشیوە کە تایبەتن بە ئادەمیزاد، ئەوانیش هیدایەتی بیروهۆش و هیدایەتی ئایینە، کە بەرزترین جۆری هیدایەتەکانە، ئەوەی کە بیروهۆش ڕێی پێ نەبات و نەیزانێت، هیدایەتی ئایین ڕووناکی دەکاتەوە بۆ مرۆڤ وەکو تاك و تەنهایی خوداو تواناو دەسەڵاتی بێ سنووری و هاتنی ڕۆژی دوایی و. بوونی بەهەشت و دۆزەخ و گەلێك مەسەلەی تر...

٧- ﴿ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾ خودایە! ڕێگای ئەو کەسانەمان پیشان بدە کە خستوونەتە بەر کەرەم و ڕەحمەتی خۆت، کە پێغەمبەران و شەهیدان و پیاوچاکانن، کە بەڕاستیی بۆ تۆ سوڵحاون و لەجێبەجێکردنی فەرمانەکانتدا کەمتەرخەمییان نەکردووە، وەیارمەتیمان بدە بۆ شوێنکەوتنی ئەو ڕێگا ڕاستە.

﴿ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴾ نەك ڕێگای ئەوانەی کە بە ئارەزووی خۆیان لە ڕێگای ڕاست لایانداوە و کەوتوونەتە بەر غەزەبت، ئەوانەی کە فەرمانی ئایینیان بەڕاستیی پێ گەیشتووە، بەڵام پشتیان تێکردووەو کەوتونەتە شوێن ئارەزووی خۆیان.

﴿ وَلَا الضَّالِّينَ ﴾ هەروەها نەك ڕێگای ئەوانەی کە فەرمانی ئایینیان بە باشی پێ نەگەیشتووەو، لە بیروباوەڕیاندا بەهەڵەداچوون و سەریان لێ شێواوە. ئیمامی موحەممەدیشی گەورە (ئیبن کەثیر) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ﴿ غَيْرِ

﴿ٱلْمَغْضُوبِ﴾ ئەوانەن کە هەرچەندە (حەق)یان بۆ دەرکەوتووە، بەلام لایانداوە لێی. ﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾یش ئەوانەن کە حەقیان لێ ئالۆزکاوەو نازانن حەق و راستی کامەیەو گومڕاو سەرگەردانن.

هەروەها دەڵێت: رێگای خاوەن باوەڕان زانینی حەقەو شوێنکەوتنێتی. جولەکەکان لە حەق لایانداوە، دیانەکانیش لە ناسین و زانینی حەقدا بەهەڵەدا چوون، ئینجا لەم بارەیەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەهێنێت. بەلام دەڵێت: رەخنە لە راویەکی فەرموودەکە گیراوە. وەنەبێت ئەم ئایەتە تەنها دەربارەی گەل و میللەتێکی تایبەتیی بێت، بەڵکو هەموو کەس و دەستەیەك دەگرێتەوە کە بە ئارەزووی خۆیان پشتیان کردبێتە حەق و راستی و دەستیاندابێتە گوناە و خراپەکاریی، یاخود لە رووکردنە رێگای راستدا سەرلێشێواو بن، بگرە هەندێکی زۆر لە موسڵمانەکانیش دەگرێتەوە، کە هەر بە (دەفتەری نفوس) موسڵمانن و بەس.

ئینجا پاش ئەم پاڕانەوەی کە سوورەتی (فاتیحە)ی پێ کۆتایی دێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: لەدوای فاتیحە خوێندن لە هەموو رکاتێکی نوێژدا بڵێن: (ئامین) واتە: خودایە لێمان وەرگرەو، دوعاکانمان قبوڵ بفەرموو! ئەم وشەی (ئامین)ە وشەیەکی قورئان نیە، بەڵکو دوعایەکەو سوننەتە.

هەق وایە کە موسڵمان دەستدەکات بە نوێژکردن بە هەموو دڵێکیەوە نوێژەکەی بکات و، بزانێت ئەو رووکردنە نوێژە مانای رووکردنە خودایە، کە دەڵێت: (الله اکبر) دەبێت دڵی وریا بێت و تێبگات کە گەورەیی خودا سنووری بۆ نیەو، لە هەموو شتێك گەورەترو بەرزترەو، ئەویش لەبەردەم ئەو خودا گەورەیەدا راوەستاوە.

کە وتی: ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ تێبگات کە ئەوە لە دەستی وەسوەسەی شەیتان پەنابەخودادەبات. کەدەڵێت: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ دەبێت ماناومەبەستەکەی بە دڵیدا بێت، کە بە ناوی خوداو بۆ ئەو دەستی کردووە

به نوێژ، ئەو خودایەی کە ڕەحمەتی بێ سنوورە. کە دەڵێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾دەبێت چاك بزانێت و تێبگات کە خودا شایانی هەموو مەدح و ستایشێکە، چونکە هەر ئەو خاوەنی هەموو ئەم مەوجوداتەیەو درووستی کردون و کاروباریان هەڵدەسوڕێنێت.

کە دەڵێت: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ دەبێت بە دڵ بزانێت و بیر بکاتەوە لەوەی کە هەر خودا خاوەنی دوا ڕۆژەو، کەسێك نیە لەو ڕۆژەدا هیچ قسەو توانایەکی هەبێت، وە خودا پاداشتی هەرکەسێك بەپێی کردەوەکانی خۆی دەداتەوە.

ئینجا کە دەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ دەبێ زۆر بە چاکیی بزانێت کە ڕووی گوتاری لەگەڵ خودای بەرزی بێ وێنەیەو، داوای کەرەم و ڕەحمەت و هیدایەتی لێ دەکات، ئینجا دەبێت بەم شێوەیە ئاگای لە نوێژەکەی بێت، خۆ ئەگەر دالغەو خەیاڵی کارێکی ڕۆژانەی دنیا ڕووی تێکرد، دەبێت هەوڵبدات لە بیری خۆی بباتەوەو دڵی هەر لە لای نوێژەکەی بێت، ئومێد وایە بەرانبەر بەو غەفلەتەی، خودا لێخۆشبووەو خاوەن بەزەییە.

ئیمامی ئەحمەدو موسلیم و ئەبوداودو نەسائی لە ئەبوهورەیرەوە دەیگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: نوێژم لە نێوان خۆم و بەندەکەمدا کردووە بە دوو بەشەوە، ئەوەی بەندەکەم دەیەوێت با بۆ ئەو بێت. کاتێك بەندە دەڵێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ خودا دەفەرموێت: بەندەکەم حەمدو سوپاسی کردم. ئەگەر وتی: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ خودا دەفەرموێت: بەندەکەم مەدح و ستایشی کردم. ئەگەر وتی: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ خودا دەفەرموێت، بەندەکەم بەخاوەن تواناو بەرزیی ناوی هێنام. ئەگەر وتی، ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾خودا دەفەرموێت، ئەمە نێوان من و بەندەکەمەو، ئەوەی بەندەکەم دەیەوێت دەیدەمێ. ئەگەروتی، ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ خودا دەفەرموێت، ئەمە هی بەندەکەمەو، ئەوەی ئەو دەیەوێت و داوای دەکات، دەیدرێتێ.